# نووسین لەسەر برژانگەکانت

هۆشەنگ شێخ محەمەد

2006/11/14 تا 2007/4/3

کوردستان

دهۆك و هەولێر

*Hoshang72@yahoo.com*

***من لە 2007/4/3 لەو نووسینە بوومەوە، دوعاش لە 2007/4/7 کوژرا.***
***دوای کوژرانت من گووتم دوعا کچی من بوو، ئێستاش کچەکەم ئەو***
***نووسینەم پێشکەشە بە تۆ و هەموو ئەوانەی وەك تۆ کوژران.***

نووسین لەسەر برژانگەکانت
نووسین لەسەر پێڵوی چاوت و نووسین لەسەر مەمك و سینگت
نووسین لەسەر گەردەنت
نووسین لەسەر پرچت
مەراقێکە کاغەز و پەڕەی گوڵ و باڵی پەپولە و رووناکیم لا ئەکاتە هیچ

من چەند مەراق بە ئاوێتەبوون و شێتبوونم بە چاو و ماچ
هێندەش مەراقم جەستەت بکەمە شعرێك ، تەئەمولەکانم لەناو خوێنتدا بنووسمەوە
لەشەوەکانی کۆڵەنوێژدا مەستم بە بۆنی خوێن و جوانییەکانی کانیلەی لەشت
مەراقم بەو خوێنە شعرێکی کورتی بەقەد ماوەی فڕینم بنووسمەوە

تەنیا جەستەی تۆم ئەوێ شعری لەسەر بنووسمەوە ئەی مەزدای روح
من چی نەماوە ئاوێتەی نەبم تەنیا خوێنت نەبێ
دەبا بمرم و لە ساتێکدا شعر و جەستەت
کتێب و نووسین و ماچ و مەمکت تێکەڵ بەیەك کەم
قەت هێندە تۆ و خواو نووسین و هەتاوم خۆشنەویستووە
هەرگیز هێندە شەیدا نەبوومە بە بۆنی بیرە و شەراب و برژانگەکانت
من لەو وەحشەتەدا جوانییەکانی هەموو ناشرینەکان سەرسامم ئەکەن
لە ساتێکدا من جەنگاوەری چ سوپایەك نیم
کەچی نووسینم ئەبێتە ئەرتەشی حەرف و هێرش بۆ تۆ ئەبات
لە کاتێکدا من رێڤینگی چ کانیاوێك نیم
کەچی رووبارەکانم بە خوڕ ئەڕژێنە روحتەوە

ئەی روحی بێ پەروازی من
من چی لەساتەکانی شێتبوون و خووگرتنم بە تۆوە بکەم
لەسەر چی بنووسم ؟
لەسەر تەم یان باران یان با؟
لەسەر چ برژێم .. چاوەکانت یان مۆزیك و رەشەبا؟
من هەمیشە بێ باڵم.. کەچی فڕەندەکانی خەیاڵ وەك فانتازی بە باڵاتا گەوز ئەدەن

لە ساتێك لە ساتەکاندا من و خۆم و تۆ و خوا و گوڵە شلێرەکان و قەمەرەکانی رۆحم بەرەو ژوانی روحی من ئەچین. من لە هەمووتان بچووکتر و نادیارترم, من هیچ نابینم ، رێیەك لە پێشمەوە نیە بیگرم و بلێم رەنگە بمانباتە ئاوێنەیەك لە ئاوێنەکانی ژیان و هەبوون. من لەو ساتانەدا ئەوەندە بێ تەئەمووڵانە ئەروانمە تۆ و خواو هەتاو و ژیان وەك ئەوەی دەمارێك لە لەشمدا نەمابێ بۆ حەزی رووچوون یان هەڵسانەوە لە شێداریدا. من ئەو دەمانە نزانم ئەمە مامز یان مرۆڤ یان پەلکە گیایەکی پڕ لە خوناو و چرایەك کە سێبەر بە بەر پێی خۆیدا بکات. من ئەزانم تۆ و خواو هەموو هەبوونم خۆشئەوێ ، من لە هەمووتان جوانترم و دەستم ئەخەمە ملتان. ئەڵێم ئەی خودا من و تۆ برادەرین وانیە؟ ئەبێت ئێمە بڕوا بە رووبارەکان و دڵۆپ دڵۆپی ئاوی چاوەکانی تۆ بێنین کە ئێمە برادەرین، تۆ ماچ ئەکەم و ئەڵێم خودا من و ئەو خۆشەویستین، ئەبێت تۆ و خەلیاقەتەکانت بڕوا بکەن ئێمە خۆشەویستی یەکین، دەست ئەخەمە ناو دەستی نووسین و ئەڵێم خوا و خۆشەویستەکەم ئەبێت بڕواتان بێت کە من و نووسین عاشقین.
لەناو گومانەکاندا پێم پێئەکەنن و ئەڵێن وەرە ئەی تەئەمولی ژەهر و رەشەبای شلێر. وەرە ئەی تورەیی شەو و جوانییەکانی دار کونێرە. وەرە تۆ دەستمان بگرە بۆ سەفەرێك لە رژان، سەفەرێك لە نووسین و بیرچوونەوە.
ئیدی من دەستەکانم هەڵئەبڕم و ئەڵێم ئەی خۆشەویست میهرێ بدە بە خوای برادەرم و تۆش ئەی خودا ماچێ بدە بەنووسین.
ئەی نووسین وەرە و لەسەر پەرەی روحمدا جوانییەکانی خوا بنووسەوە.
من ئەوەتام لە ساتەکانی سەرخۆشیدا هەست بە فڕینی ئێوە ئەکەم لە خوێنمدا
من ئەوەتام لە ناو دڵۆپێکی غەریبدا غوربەت لە چاوی رێبوارەکان دەرئەکەم
من ئەوەتام لە باخچەدا ماچەکان سەوز ئەکەمەوە
من ئەوەتام باڵەکان بە ئاوی ڤین تەڕ ئەکەم و ئەڵێم بنۆشن لە روحتانەوە جوانی بنۆشن
با هەر بەسەفای تێکەڵبوونی رەشەبا بە پرچی ژنەکەم تێکەڵ بە ژیان بین
ئەڵێم ئەی خودا تێکەڵ بە منی ئادەمی بە .. من و تۆ برادەرین هەروەك هەور و باران برادەر

ئەڵێم خۆشەویستم فریشتەییانە ماچم کە هەروەك خەندە و لێو، با لەیەکدی بتوێینەوە
ئەڵێم ئەی روحی پەرِاگەندەی من با دەنگت بەو رێیانەدا وەربیێ
با هاوارەکانت لەو هەوارانەدا ببنە قەترەی خوناوی پەرچەمی جوانترین کچی عاشق
با مەست بین ،نەزانین بۆچی بەناو تەمومژدا رێ ئەکەین و یەکدیمان خۆشدەوێت
با بیرمان بچێتەوە عەشق چەند کۆنە .. خوا چەند جوانە تۆم چەند ئەوێ
با یەکدی بپەرستین .. وەك خۆشەویستی گیا بە خاك .. نا وەك هیچ نا یەکدیمان خۆش بوێ
ببینە پارچەیەك لە با و لەرەی جوانی ژیان
با نەبینە هیچ .. با نەبینە ساتی سەرخۆشی شاعیر و با نەبینە رەنگی دار با نەبینە بۆنی خاك و با نەبینە سێبەر
با نەبینە ئەوشتانەی لە ئێمەوە ئەرژێن و رێیەکان ئەشێوێنێ
لێگەرِێ ئەو ژیانە لەو شەوەدا چۆن رێ ئەکات با بەدەر لەدەستی ئێمەوە بروات
ئەی خودا ئەمشەو لەگەڵ مندا ئادەمییانە باوەش بە ژنەکەم دا بکەوە و بڵێ هۆشەنگ خۆشیدەوێت و ئەیەوێت من ماچ بکەیت
ئەی خودا خۆت بکە بەباوەشی مندا و با ئادەمییانە لەسەر باسکەکانتدا بگرێیم و بڵێم ئاه چەند خۆشە گریان لە باوەشی تۆ و ژنەکەمدا
ئای چەند خۆشە رێکردن بە باخچەکاندا لەگەڵ تۆ و هەتاو و ژنەکەمدا
ئای ئێوەم چەند خۆشئەوێ لەم شەوەدا کەمن مەراقم لەسەر جەستەی تریفەدا بنووسم لەسەر برژانگەکانی دانیشم و لەگەڵ بۆنی خوێنی سەرخۆش بم
ئای لەو ساتانەدا چەند ئەمەوێ ببمە ئادەم و هەر لەبەهەشتدا حەوا بکەم بە ئەستێرە و بە دار و بە پارچەیەك لە باخچەی سێو و هەموو رەنگەکانی جوانی
حەزم لێیە ئادەمیانە بڵێم ئەی شەیتانی ژیکەلە بێ تۆ و بێ قسە جوانەکانت من مەراقم لەسەر جەستەی حەوادا شعرێك بە پەلکی سێو بنووسمەوە
حەوا و حەوشەی بەهەشت پرِکەم لە بۆنی سێو.. باخەڵی پرِکەم لە جوانییەکانی سێو
با مەست بین من و تۆ ئەی شەیتانە جوانەکەم بە بۆنی سێوی حەوا و حەوا لە شەرابی سێودا هەڵکێشین
ئای چەند خۆشە من و حەوا لەو شەوەدا بێ ئومێد بەرەو باخی سێوەکانی بەرواری بفرِۆین و بە باخەوانەکان بڵێین با ئەو دەڤەرە و دونیا هەمووی مەست بێت بە بۆنی سێو
با گەردوون مەست بێت بە بۆنی سێکس و چێژو لەزەت
با مەست بین مەست وەك حەوا و وەك باخەکانی بەرواری باڵا تا عەشق بەوناوەدا وەربێت و پیاسەکەی ئێمە پرِکات

باخەڵ و سینگی ئێمە تژی کات
با بڕۆین بۆ هەرێمی بۆن و مەراق بەنووسین لەسەر سێو
ئەی سێوی روحی من .. ئەی سێوی شەهوەت و قەهر و عەزاب
ئەتکەم بەشەراب بۆ سەر دنکە هەنارەکانی عەشق و ئەڤین و ژیان
وەرە ئەی خودا بابڕۆین ئەمشەو شەیتانیش ئادەمێکی ژیکەلەیە و تاقەتی هەیە باوەشت پێدا بکات
وەرە ئەمشەو شەوی بیرچوونەوەی تەمەنە لە دین و شەوی دینێکە لە رۆشنایی
وەرە و بڵێن با بڕۆین بەرەو باخەکانی سێو و جوانی

دە خودای من لەمشەوەدا بارانێکی سێو ببارێنە و ختممان کە لە ئاوی سێو
من و حەوا و تریفە و ئادەم و فرندە و شتەکان سەرخۆش کە بە بۆنی سێو

دەببارێنە .. شەرابە سێو بەسەر دڵ و تەئەمولەکانمانەوە ببارێنە
ببارێنە با لە سێودا جوان بینەوە و بۆنی ئادەمیانەمان خۆش بێتەوە
با جوان بینەوە و مەراقەکانمان لەو هەبوونەدا دەرباز کەین
با خەون بە شتێکەوە ببینین کە لە رۆشنایی ئەم ژیانەدا نایبینین
با ئومێدێك بخەینە دڵمانەوە کە لەم جەنگانەی رۆژانەدا دەستمان ناکەوێ
با خۆزگەیەك بکەین بە شیعر کە لە رامانەکانی ئەو باخانەدا خۆی ناکاتە هەناسەمانەوە
با بە مەستی شعر پێشکەش بەیەك بکەین و ماچیش وەك گوڵ بگۆڕینەوە
با دەرچین لە پێستی هەبوونمان
یان لێگەڕێ با ئەمشەوە پلان بۆ جوانی دانەنێین
با پلان بۆ مەستی دانەنێین .. بێ بەڵگەی جوانی بەو ناوەدا بسوڕێینەوە و ساتەکانمان خاڵی کەینەوە لە خۆمان
با بە غەیبدا رێ کەین و غەیبی عەشق و مەراقەکانمان بژین
با خوداییانە نا .. وەك ئادەمییەکی بێ هزر و دەسەڵات بەناو غەیبی جوانیدا رێ کەین و تەنیا تەماشای نادیارەکانی وجود بکەین
با لە غەیبدا رێ کەین بەرەو شێتبوون و سەفا
با لە بێئاگاییدا سەفەر کەین رووە و گاڤەکانی رۆشنایی
رۆشناییمان پێ ببەخشە .. گۆرانیمان پێ ببەخشە
یان نا هیچمان پێ مەبەخشە تەنیا بماندەرە دەستی غەیب ، هەڵمانبگرێت

تەنیا بمانبەرە سەر رێی غەیبستان و ئیدی لەوێوە بەرەو تەواو بوون برِۆین
بەرەو باخچە نادیارەکانی دیتن و روانین
با برِۆین و بلێین تۆ لەکوێی ئەی ئازادی .. تۆ لە کوێی ئەی گوڵە باخ
تۆ لە کوێی ئەی نووسین لەسەر جەستەی تریفە و شعر گووتن لە برژانگتدا
تۆ لەکوێی لەو نادیارخانەدا ئەی برادەر گیان
من ئەوە دێم و خۆم ئەدەمە دەست هێزی سەفەرێك جوانتر لە قەدەر
جوانتر لە سەفەری هەموو فرِەندکان
جوانتر لە خەیاڵی فانتازیاترین تریفە لەناو حەوزی کەوسەردا
خۆشتر لەسەفەرەکانی مێخەك بە نێو مەمکدا
با برِۆین بەرەو مەڵبەندەکانی بزربوون .. پرسیاری جوانی و ماچ و نووسین نەکەین
با نەڵێین تۆ لەکوێی ئەی خۆشبەختی
با نەڵێن تۆ لەکوێی ئەی ژن .. با نەڵێین و هیچ نەڵێین

هەڵمبگرە ژنە جوانەکەم لەم سەفەرەدا هەڵمبگرە.. با لەو نادیارەدا بیرم نەچێت مــن رۆژێــك مــەراقم بــوو بــە خوێنی تۆ شعرێك لەسەر جەستەت بنووسم، هەندێ وشە لەسەر سینگت بنووســم و نیگارێــك لەســەر پرچــت بنەخشێنم
با بیرم نەچێت رۆژانێك مەراقی جوانی ئەو دونیایە بووم
حەزم ئەکرد بەناو رەشەبادا ماچت بکەم و بە رووتی لە ژوورەکەماندا تابەیانی لە باوەشی یەك بنووین
با بیر نەکەین رامان لە پەرچەمت بۆ من گەورەترین داستانی نەخش و چنین بوو
با بیر نەکەین چەند حەزم ئەکرد ئەو پرچە بۆن کەم و ماچ کەم و رووی خۆمی لەناودا بزرکەم
پرچت هەموو جوانییەکانی تۆ و من و خوای لە خۆوە گرتبوو
با بیرم نەچێت خۆشم ئەویستی.
با بیرم نەچێت هەموو کچەکانی کوردستان و ئەو گەردوونەم خۆش ئەویستن و حەزم ئەکرد هەموویان ماچ کەم
با بیرم نەچێت زەمانێك من مەست ئەبووم لەکاتی نووسینی نامە بۆ کچەکان و برادەرەکانم
بیرم نەچێت من لە ناو تورەهاتی ئەو ژیانەدا جگەرەیەکم ئەکرد بە لا لێومەوە و بەبەر جادەی تەوارییەوە لەبەر خۆمدا ئەموتەوە:(ئەی کچی جوان خۆشم ئەوێی هەموو هیوام دڵی تۆیە .. تــف ئەکــەم لــە زەقنووبەتــەکانی ژیان و رووئەکەمە کەعبەی چاوەکانت .. بمگرە باوەشی خۆت و حەزم لێبکە .. حەزم لێبکە و وەك بۆنی سێو با لە گەردەنتەوە بێم .. من تەنیا روحێکم هەیە ئەمەوێ قوربانی تۆی بکەم و بە عەشقی تۆوە بۆ ئەبــەد بــژیم .. ئەمگووت ئەی کچی خوا .. خۆ من هەست ناکەم من کورِی خوام .. نزانم من لە بەنی ئادەمم یــان بــەنی گــوڵ

یان فرِنده، من هەر هێندە ئەزانم تۆ بەنازترین کچی خوایت و منیش سوژدەت بۆ ئەبەم.. من خۆشم ئەوییێت و ئەمەوێت تۆش خۆشت بوێم.. من بۆ تۆ ئەنووسم و لەم قاتییەشدا هەر بۆ تۆ جگەرە ئەکێشم .. ئەگەر نا ئەو دوورییە لە تۆ ئەمکوژێ .. ئەو دوورییە تەواوم ئەکات بێ ئەوەی پەیامی خۆشەویستی و عەشقی خۆمت پێ بڵێم .. لەسەر ئەو رێگایەدا ئەوەندە ساکار ئەبوومەوە و ئەمووت کچێ .. دەبا روحم سەرگەردانت بێت و تۆ و شەقلاوەش لەناو روحی مندا بینە ژەهریش هەر شادومانم .. کچێ دەبا ئەو جارەش بتبینمەوە و پێت بڵێم خۆشم ئەوێی و تۆش منت خۆش بوێ .. ئەوەندەم تەمەن بەسە .. ئەوەندەم ژین بەسە .. زۆر ساکار بووم رازی بووم تەنیا خۆشت بوێم و بێ ماچ و بێ رۆیشتن لەبەر باران و هەتاو و پیاسەکردن بەناو باخەکاندا رازی بووم. تەنیا ئەمەویست کە سەر ئەنێیتە سەر سەرین بیر لەمن بکەیتەوە و شعرێکم بخوێنیتەوە و بڵێی ئەوە تۆیت خاوەنی ئەو هەناسانە؟ من ئەوەندە ساکار بووم تەنیا ئەمەویست تۆ خۆشت بوێم .. ئەوەندەم بەس بوو تا من لە خەیاڵمدا دونیا بکەمە گوڵزار و هەموو دەم پیاسەی تێدا بکەین و بەردەوام شعرت بۆ بخوێنمەوە .. بەردەوام بە خەیاڵ لە باوەشتدا بنووم و باران لێماندات.. هەر بەخەیاڵ سێوێکت بۆ پاك کەمەوە و بیخەمە ناو سینگتەوە و بڵێم ئەو سێوە دڵی منە .. ئەو سێوە روحی منە، با هەمیشە لە دەست و باخەڵی تۆدا بێت من گیانم تەسلیمی چاوەکانت ئەکەم. من هەر بەخەیاڵ لەو رێیانەدا خەونم ئەدی و جگەرەکەش بە لا لێومەوە ئەبووە مشکی و روحم هەلا بەهەلا ئەبوو.. گیانم ئەکوژرا و منیش نەئەمردم .. پێم ئەگووتی ئای چەند خۆش بوو لەو ساتەدا بمبینیت و بزانیت من بیر لە تۆ ئەکەمەوە .. بارانێك بە خوڕ ببارێت و تۆش لێم راست بێیت و یەکسەر بێ قسە باوەشم پێدا بکەیت و من و تۆ و باران تەنیا لەسەر ئەو شەقامەدا بەیەکەوە تێکەڵ بین و بەروح بەیەکتری بڵێین خۆشم ئەوێی ئەی روحی جوان .. ئەی جوانترین تەراِیی ئەم گەردوونە.. خۆشم ئەوێی ئەی بێنازترین ئافەریدە .. لەم ساتەدا ئیدی تۆ ببایتە شەونازی ساتە درێژەکانی شەو کە هیچ بە هانامەوە نەئەهات و جگەرەشم نەئەما بیکێشم .. ئا لەو ساتانەدا بوو کە هەموو خۆشەویستیم بۆ تۆ لە جگەرەیەکدا بەرجەستە ئەبوو و ئەویشم نەبوو بیکێشم .. من تا لە بیرم نەچێت ئەبێت بڵێم هەر ئەوەبوو وای لێکردم شەش ساڵ جگەرە نەکێشم .. شەش ساڵ لە دووری ئەو شەقامەوە بێ جگەرە ژیان بەرِێ کەم.. شەش ساڵ بێ دوکەڵی ئەو عەشقە و بێ بۆنی ئەو خۆشەویستییە .. تا دوا جار هەموو شتەکان گۆڕان و جگەرەش تامی جاران و شەقامیش تامی جاران و خەیاڵیش تامی جاران و خۆشەویستیش تامی جارانی نەما .. هیچ نەما وەك خۆی تام بداتەوە..، منیش تامی جارانم نەما .. ئەبێت ئەو شتانە بنووسمەوە ئەی تامی باران و هەنار .. من کە لەو شەوانەی ئومێدم ئەخواست گوڵە ژاڵەیەك یان رێحانێکی ناو حەدیقەکەتان بوومایە و جاروبار بۆنم بکەیت و بمخەیتە ناو مەمکەکانتەوە.. جاروبار چاوێکم بدەیتێ و شەوباشێکم لێ بکەیت و بڵێیت شەوت خۆش ئەی مەست بە بۆنی من .. چەند مەراق بووم بۆنی تۆ لە کەدە رێحانەکانی من بهاتنایە و تێر تێر بۆنم کردبایت .. ئەوانە رۆژگارێك بوون پێش ئەو شەوە .. رۆژانێك کە هیوای مرۆڤانەی من هەمووی ئەوەبوو بڵێیێت خۆشم ئەوێی..

گیانەکەم بەر لەو سەفەرە ئەبێ زۆر شت بنووسمەوە و بڵێمەوە تا لە بیریان نەکەم کە من چۆن حەزم لــە تریفــە کرد.. چۆن فێربووم لەبەر هەتاو دانیشم و باسی عەشق بۆ خەلیاقەتەکان بکەم.. چۆن لە دهۆکــەوە نامــەم بــۆ هەندرێن و برادەران ئەنووسی .. چۆن باسی ژیانم ئەکرد و چۆن جوانیم شی ئەکردەوە .. ئەو شتە جوانانــە ئــەبێ بنووسمەوە ، بۆ ئەوەی بیرم نەچێت من ژیانم بەو سەکسارییانەوە چەند ئەویست، ئەبێت بیرم نەچێت نووســین لــە ساتەکانی ئۆرگازم و نووستن و خەون خۆشتر بوو، چیرۆکی یەکەم ماچی مــن لــە هــەموو جوانییــەکانی خــوا و ئەدەب و بەهەشت و فانتازیا جوانتر بوو، یەکەمین ماچ و تفکردنە سەر لێوی کچێك کــە لــە هــیچ کچــەکانی خواو شەیتان و ئادەم ناچوو، ماچێك کە لە روحەوە ئەهات و لەسەر لێومدا ئەتوایەوە .. بە هەزار و یەك بۆن و بەرامەی سحرەوە ئەتوایەوە و ئەتفایەوە و ئەرژایەوە، ئەوە چیرۆکی جوانی نەبوو .. چیرۆکی هەوەس و چێژ نــەبوو .. حەکایەتی جەستە نەبوو .. ئەوەندەی سەربوردەی ئەو دڵ و روحە شێتەم بوو بــۆ جــوانی و بــە دەســتیهێنانی ساتێکی نادیار .. ئەوەندە سەرگەردانی ئەو دەسەڵاتە بوو کە لە سەفەرێکی غەیبیانیدا خۆی بزر کات. وەك ئەو ساتەی ئەو شەوە بــوو کــە خــوا دەســتێکی لەســەر شــانمە و شــەیتانیش لــە باوەشمــدا پێئەکــەنێ و تریفــەش چایەیەکمان بۆ چاك ئەکات. وەك ئەو ساتە بوو بەلاَم لە هــیچ ســاتێکی مێــژوو و میتۆلۆژیــا و داســتانەکانی عەشق و موحیبەت نەئەچوو . وەك ساتەکانی ورێنە کردن و غەیبوبەکانی لەحاڵچوونم نەبوو لــە شــەوقەکانی تەسەوف و زیکردا .. وەك ساتی نووسینی شعر و خواردنەوە نەبوو .. وەك ساتەکانی ئەو داڵغانەش نەبوو کە لە شەقامەکەی تەواریدا لەگەڵ جگەرەو روح ئەمکرد .. ساتێکك بوو لەدەرەوەی زەمانی باران و هــەور و هــەتاو و سەردەمی گوڵە قەتمەرەکان و فرینی فرندە و داکەوتنی مانگدا.. ساتێك بوو بۆیە ئەبێت بینووسمەوە و هــەموو شتێك بوو و هیچیش نەبوو .. ساتێکی غەیبیانی بوو .. گەشترین نادیاری دیاری ژیان و هەبوون بــوو. مــن لــەو ساتەدا ژیانم بە لێو و زمانەوە دیت نەوەك بە چاوەکانم .. وجودی خۆمم بە پەنجەکانمەوە ناسی ..

ئەبێت ئەو ساتانە لەبیر نەکەم ئەوانە سەفەری منن بەناو ژیان و بەناو نادیارییەکانی ئــەو ســاتانەی مەســتی ئەگەیشتە لووتکەی خۆی ..

بەڵێ ئەی فرِندە تۆ لە روح جوانتر بەرەو هێلانەکەت ئەنیشیتەوە ...

من لەو ساتەوە دڵم دا بە تریفە و تا ئێستاش لەگەڵ ئەودا سەفەر ئەکات

هەمیشە لە پرچی ئەودا تریەی دێت و لە ناو چاوەکانی ئەودا ئەنوێت

من دیار نەمام وەك ئەوەی پیاسەم بەسەر شەقامەکاندا ئەکرد و لەبن سێبەری چنارێکەوە شعرم ئەنووسی

من ئەوە نەمام لە سەر جۆگەلەیەکی خرِیندا بگرییێم و .. بۆ تامی خاك روحم بدەم لە فیشەك

من ئەوە نەمام بەسەر جۆخینەکاندا لاسکە گوڵە گەنمەکان بکرۆژم و بڵێم ئای ژیان چەند جوانیت؟!

من ئیدی لەو هەوارانە رام کرد کە ئەیانبەستمەوە بە روح و دڵ

من ویستم ئیدی روح ئازادبێت لە دەروونم

دڵم مەست بێت بە گەرِان بەدووی خۆیدا

ویستەکانم لەوە گەورەتربوون بە ماچێك و پیاسەی بەر بارانێك دانیشێت و شعر بلێت
من تێگەیشتم من هیچ نیم جگە لە سێبەر و فڕین بەو ئاقارانەدا کە بۆ جاری سەدەمین روحیان ئەدام لە مردن و جوانی
بۆ من مردن و جوانی بەس نەبوو بۆ ژیان
ژیان خۆی بەس نەبوو بۆ من
من وام لەناو ئێوەدا ئەی خودا ئەی تریفە ئەی خەیاڵ و فانتازیا
من وام لە ناو نادیاری خۆمدا سەرگەردان
وەرە ئەی دڵ لە گاڤەکانی رۆشناییدا بەسەر ویستەکاندا بتوێوە
وەرە ئەی هزر لە ساتەکانی بۆشاییدا لە بەرامبەر حەوادا لە بۆنی سێودا خۆت بنووسەوە
من و تۆ ئەوەندە بەریئانە لەو سەفەرە دەرناچین
ئەبێت تامی سێو وەك حەشیشە بخەینە سەر دەستمان و هەڵیکێشین
ئەبێت تا ئەو پەڕی مەستبوون بە جوانی و بیرەوەری مەست بین
ئەبێت لە بیرەوەری خۆماندا ختم بین و بزر بین لە خەیاڵگەی خۆمان
بزر بین و رییەکان بۆ ئەبەد ون کەین
چیرۆکەکانی یەکەم ماچ و دواهەمین ماچی ئەو لێوانەش لە بیر کەین
بڕۆین و چرایەك نەبێت بۆ ماتەمی
گوڵێك نەبێت بۆ خۆشەویستی
هەناسەیەکمان نەبێت بۆ یەك
بڕۆین بیرمان بچێت هەزار ماچمان لەیەك کردووە
بیرمان بچێت هەزار شەو بەیەکەوە نووستووین
با بڕۆین و وڕێنەکانمان بنووسینەوە
من مەراقم مەراق ئەی کچی شەوبۆ .. ئەی رێناز و لەنجە
من مەراقم بە چاوەکانی تۆ لە سەفەرێکی بێ رەحمدا
من شێتم بۆ تۆ لە شەوێکی بێ رەحمدا
بێرەحمانە پێ بنێ بەسەر کتێب و دەستنووسەکانم
بێرەحمانە بەسەر دڵ و هزر و مەعریفەم رێکە
با بەس بێت ئەو گۆرانیانەی شەوانە بۆت ئەڵێم و ئەو جوانیانەی پێشکەشت ئەکەم
بەسەر چوو سەردەمی قوربانی بۆ چاوەکانت و نوێژکردن بۆ مەمکەکانت و رووچوونە ناو دڵت
من تەواو ئەبێ لە ناو نادیارییەکانی خۆمدا تۆ فەناکەم

جوانی ئێستا لە دڵمدا مێلاقە هەنارێکە و پەنجەکانی تۆ رەنگ ناکات

جوانی ئێستا هیزارێکە و رووی تۆ داناپۆشێ لە ناو پەردەدا..

من بێ رەنگ و روو ئەبێ ئەمشەو خۆم بدەمە دەستی خودا

بێ بۆن و تام خۆم بدەمە دەم بۆنی سێو

ئەمشەو بێ گۆرانی بەوناوەدا وەرئەبم و مەراقەکانم ئەخەمەوە دڵمەوە و بۆ دوا جار بیر لەو رۆژانە ئەکەمەوە کە تیایدا پارچە پارچە ئەفریم

دڵۆپ دڵۆپ ئەرژامە خاکی غەریبی

هەڵا هەڵا بە سەرگەردانییەوە لە تۆم ئەڕوانی

بە دڵرەقییەوە پیاسەم ئەکرد

رۆژگارێك بوو تفی لە عاشقەکان ئەکرد، من لەوەتەی خۆم ناسی بوو عاشق بووم ، عاشقی هەموو ئەو کچانە بووم کە ئەمدیتن و جا بەهەر شێوەیەکەوە بمدیبیان، عاشقی یەکەم کچ بووم کە خوشکم بوو، خۆشترین ساتەکانم باوەشی ئەوبوو کە لەگەڵ بۆنی مەمکی سەرمەست ئەبووم و خەو ئەیبردمەوە، ئێستاش من هەر مەراقی ئەو باوەشەم، باوکم عاشقێکی دڵتەڕ بوو تەنیا ئەو خۆی لەگەڵ دایکم ئەنووست و بیرم دێت سەردەمێك کە لە نێوان ئەواندا ئەنووستم هەموو بەیانیان کە بە ئاگا ئەهاتم من لە تەنیشت باوکمەوە بووم و ئەوانیش لە باوەشی یەکدی، بۆیە من یەکەم بۆنی مەمك کە پڕایە روحمەوە هی خوشکم بوو، بۆنێك بوو هەمیشە لە رێحان ئەچوو ، لە شەوانی زستاندا لە بۆنی بەفر ئەچوو بە گەرمی، بۆنی مێلاقە هەنارەکان لە سینگی ئەودا ئەوها ئەهات ئەتگووت هەنارەکان لە ساپیتکەکانەوە هاتوونەتە خوار و لە سینگی ئەودا نووستوون، ئەمگووت خوشکەکەم بۆنی هەنار لە سینەت دێ ، ئەیگووت ئەوە هەناری مەمکەکانمە برام، ئەمگووت هەناری مەمکەکانت دنك دنکن؟ ئەیگووت نا.. پارچەیەکە لە گۆشت و خوێن. ئەمگووت ئەی شیر؟ ئەیگووت جارێ نا . ئەمگووت ئەی کەی ؟ ئەیگووت برام ئەو پرسیارانە مەکە.. منیش هەندێ جار بێدەنگ ئەبووم و ئەمگووت دەستیان کەمێ ؟ پەنجە ناسکەکانی ئەگرتم و ئەیخستە ناو سینگییەوە، یەکسەر تەزووێکی گەرم بەناو پەنجەکانمەوە ئەکەوتە روحمەوە، من هەر هێندەم ئەزانی کاتێك بەیانییە و لە خەو هەڵئەستام و پەنجەکانم گەرم گەرم بوون. شەوێکیان خۆی گووتی برا ئەتوێ بزانی کەینێ شیر لە مەمکەکانمەوە ئەرژێت؟ گووتم ئا.. گووتی کە دەستی پیاوێکی گەورەی بگاتێ . گووتم پیاوێکی وەك کێ ؟ گووتی وەك هەموو پیاوە گەورەکان، گووتم چۆن ؟ تۆ نازانی هێشتا گچکەیت برا گیان .. گچکەیت و بە پەنجەکانی تۆوە نە شیر ئەرژێ و نە خوێن .. تۆ هێشتانەکە ماوتە لەو شتانە بگەیت .. تۆ گچکەیت بۆ باسی شیر و خوێن ..، لە تاریکیدا زانیم چاوەکانی فرمێسك ئەڕێژن ، گووتم گریانت دێ گووتی نا.. گووتم با ئەوانە فرمێسکن لە چاوانتدا .. رووی کرد بەم لاوە و بێدەنگ بوو و منیش خەوم لێکەوت، شەوێکی دیکە .. گووتم خوشکەکەم پیاوێکی وەك کێ ؟ گووتی وەك .... بێدەنگ وەستا و گووتی لێگەڕێ ، رەنگە پەنجەکانی تۆ لەو میهرەبانتر بن،

ئیدی من تا ئێستاش نەمزانی ئەو پیاوێکی وەك کێـی ئـەوێ .. پیـاوێکی گـەورەی وەك بـاوکم وەك بـرام وەك مامۆستاکانم وەك کرێکارەکانی لە ماڵمان ئیشیان ئـەکرد یـان ئـەو شـوفێرانەی جاروبـار لـە سـەفەرەکاندا ئەمدیتن.

تا ئێستاش نەمزانی ئەو مەراقی پەنجەکانی کێ بوو؟ پەنجەکانی مێردی یان هەر پیاوێکی دیکەی گەورە؟ نەمزانی و لەم شەوە نەعلەتیەشدا ناکرێت بزانم .. بەڵاّم من ئەوەم زانی کە مەمك چەند لەزەت بەخشە پارچـە گۆشتێکە پڕە لە بۆن و سەرسامی، کە گەورەش بووم پەنجەکانم هەرگیز هەندە شاد نەبوون لـەوەی کـە لەسـەر مەمکێك ئەنیشتنەوە، ئێستاش بۆ من مەمك جوانترین پارچەیە لـە هـەبوون، لـە هـەموو شـتێك جـوانتر و میهرەبانتر و خۆشەویستتر، ئێستاش بڕوام وایە هەمووکچەکان خەون بە پەنچە گەورەکانەوە ئەبینن. شەوێکیان بە خوشکەکەم گـووت، مـن کـەینێ پەنچـەکانم گـەورە ئـەبن؟ گـووتی بـۆ ، گـووتم تـا مەمکـەکانی تـۆی پێبگرم؟پێکەنی و گووتی کە پەنچەکانت گەورە بوون نابێت دەست بخەیتە باخەڵمەوە. گووتم بۆ؟ گووتی نابێـت خوشك و برا دەست لە یەکدی بدەن؟ گووتم بۆ ؟ گووتی لێگەڕێ تۆ هێشتا گچکەیت. گووتم ئەی ئـەتوانم هـی کێ بگرم؟ گووتی ئی هەموو کچەکانی دی. گووتم بەراست هەر هەموو کچەکانی دنیا ؟ گـووتی ئائـا. گـووتم هی مامۆستا نەرمینیش؟ پێکەنی و گووتی بۆ ئەو؟ گووتم زۆر جوانن. گـووتی چـۆن ئـەزانی جـوانن . گـووتم برادەرانی مەکتەب وا ئەڵێن دیبوویان مامۆستای بیرکاری مەمکەکانی گرتبـوون. گـووتی خۆزگـەم بـەخۆی. گووتم بۆ خۆشە مامۆستای بیرکاری مەمکت بگرێ؟ گووتی ئەو نا .. گووتم ئەی کێ ؟ گووتی پیاوێکی گەورە. ئیدی هەر نەمزانی ئەو پیاوە گەورەیە کێ یە.

پیاوی گەورە بۆ من تا سەردەمێکی درێژ ئەو کەسە بوو کـە مـەمکی کچـەکان بگـرێ. منـیش گـەورەبووم و پەنچەکانم کەوتنە سەر مەمك.

من لە پیاسەکانی شەقامەکاندا زۆر جار بە خەیاڵ مەمکێکم ئەگرت و ئەممژی . ئەممژی و ئـاو و شـیرم بەسـەر لێودا ئەڕژا ، ئەو خەیاڵانە ئەوەنـدە خـۆش بـوون تـا رادەی لەدەرچـوونی روح. تـا رادەی کوشـتن لەسـەر ئـەو شەقامانەدا.

ئەمە جگە لە خەیاڵەکانی شەو کە مەمکی هیچ کچێك و ژنێـك لـە چـاوانم جیـا نەئـەبۆوە و هێیشـیان لـە پەنچەکانم دوور نەئەکەوتنەوە. ئەمگرتن و ئەممژین، تـا سەرخۆشـبوون ئەممـژین و ئەملێسـتنەوە. بـەڵاّم هـیچ خەیاڵێك نەگەیشتە ئەو ساتەی بۆ یەکەمجار مەمکی یەکەم کچم گرت، کـەوەك روحلەبـەرێك نوسـتبوو و بـە پەنچەکانم بە ئاگام هێنان، لەیەکەم گرتندا ، گووتم ببورە کۆڵن ویلسۆن شەکرت خوارد کە گووتت خەیاڵیانـە خۆشە لەگەڵ ژندا بنوویت نەوەك بە هەقیقەت. ئەو ساتە مـن تێگەیشـتم هەنـدێ جـار خوێندنـەوەش چـەند سەخیف و دوورە لە راستی؟! تێگەیشتم هەندێجار خەیاڵ هەرگیز ناگاتـە سـاتی راسـتی، هـەرگیز درێـژترین فانتازیا کورتە لەبەردەم کورتترین بەرجەستەبوونێکی دروست.

من لەو ساتەدا رقم لە خەیاڵ و خوێندنەوە بۆوە، گووتم شاد بە ئەی پەنجە .. شاد بە ئەی دەست کە لەسەر مەمکی کچێکدا تامی جەستە و گۆشتی ژن ئەکەیت، گۆشتی ژن پڕ بوو لە ڕۆح پڕ بوو لە خەیاڵ و فانتازیا ، خەیاڵ و فانتازیاکانیش خاڵی بوون بەرامبەر بەو دیمەنە. من شادومانترین ئافەریدەی ئەم کەونە بووم کە مەمك لە نێو پەنجەکانمدا کڕ ئەکەوتن. کە لێوم پێیاندا هێنا و زمانم لێ خشاند بوومەوە ئادەم. بوومەوە ئەو منداڵەی تازە تێئەگەیشت خوشکەکەی بەر لە بیست ساڵ بەدوای ئەو چێژە ئەگەڕا، گووتم سەلاوات ئەی خوشکە میهرەبانەکەم .. درووود بۆ ئەو جوانییە، درووود بۆ ئەو ڕاستی یە.

خۆش بوو وەك ساتەکانی بەرباران و هەتاو نا .. وەك ساتەکانی گەیشتنی ڕۆح لە نوێژدا بە خوا نا، من زۆر ساتی خۆشم هەبوون لە ژیاندا .. ئەو کاتانەی باخچەکەمان لە نیوە شەو ئاو ئەدا و ئەو ساتانەی بۆ مەرگی خۆشەویستان ئەگریام و ئەوساتانەی نامە و وێنەکانی یەکەم خۆشەویستم سووتاندن و ئەو ساتانەی لەسەر جۆگەلەکەی نزیك ماڵەوە دائەنیشتم و جگەرەیەکم بە دزییەوە ئەکێشا و ئەو ساتانەی هەستم ئەکرد کچێك باسی کردووم و گووتوویەتی چاوەکانی جوانن، ئەوساتانە هەمووی نەشئە بەخش بوون، بەلاّم هیچ ساتێك وەك ئەو ساتە نەبوو، من شەوێکیان کە چیرۆکی گرازییێلا – کچی ماسیگرەکەم خوێندەوە یەکسەر دووبارە خوێندمەوە و تەواو پێیەوە مەست ببووم و دوای چەند ساڵێکیش جارێکی دیکە خوێندمەوە، بەلاّم کە یەکەم ماچم لە مەمك کرد تا ئەو ساتەش حەز ئەکەم هەمیشە دەستم بە سوخمەیەك بگات. سوخمە جوانترین پارچە جلی کچ و ژنان، من لە دوورییەوە هەندە مەراق بە سوخمەم حەز ئەکەم هەموو ساتێك یەکێك لە جانتاکەمەوە بێت. سوخمە .. ئەو پارچە پەڕۆیە ڕۆحی ژن دائەپۆشێ و هەمیشە بۆن و بەرام و جوانییەکانی مەمك هەڵئەگرێت. سوخمە تازەترین پارچەیە لە ڕۆحی ژندا، ناسکترین و فانتازیاترین پەڕۆیە لە جلوبەرگەکانی ژندا.

من ئێستا بیر لەوە ئەکەمەوە ئەبوایە من سوخمە فرۆشبام نەوەك شتێکی دیکە، ئەبوایە گەورەترین دوکانی سوخمەم دانابا و مەمکی هەموو کچەکانی ئەم گەردوونەم بەو سوخمانەوە داپۆشیبا کە مەمکەکان جوانتر و جوانتر بکات. ئەو سوخمانەی بەشێکیان بە دانتێل پڕ ئەکرێنەوە ئەوانە سەرنج ڕاکێشترین سوخمەن بۆ من کە لایەکی مەمك لەبن ئەو سوخمانەوە ئەوەندە بە جوانی خۆیان بۆ مرۆڤ دەرئەخەن وەك ئەوە وایە ناز بەسەر پەنجە و چاوەکانی پیاودا بکات. لەکاتی داکەلاندنیشیدا ئەوەندە میهرەبانە کە ئەتوانێ هەمووجوانییەکانی دونیات پیشان بدات و هەر بە لێو بیهێنێتە خوارەوە.

سوخمە ئای سوخمە .. یەکەمیان ڕەنگاوڕەنگ بوو کە جوانترین مەمکی ئەو دونیایە لە بنیدا خەوتبوو و من بە ئاگام هێنان.

ئیدی ئەوەیان سەفەرێك بوو جوانترین نهێنییەکانی ژیان و چێژوو خۆشی نیشاندام، نادیارییەکانی جوانی ئەوەندە زۆرن کە سەفەری بەردەوامیش فریا ناکەوێ نیشانت بدات.

ئیدی من ڕۆحی پەڕاگەندەی خۆم بۆ کوێ بەرم ئەی خوشکە میهرەبانەکەم

گیانی بێزاری خۆم .. دڵی تۆراوی خۆم لەو ئاواییەدا بۆ کوێ بفرێنم
من بە ئومێدی چ سوخمەیەکەوە شعری دی بنووسم و دەست بۆ چ بوونەوەرێك ببەم وەك تۆ میهرەبان بێت ئەی خوشکە قەتمەرەکەم
من لەدەست ئەو سەرەم بۆ کوێ پرسیارەکانم وەك گومان پێشکەش بکەم
گومان لە جوانییەکانی مەمك و شادومانییەکانی پەنجەکانم
پەنچە گەورەکانی منی پیاوی گەورە
ئەی سوخمە فرۆش .. بەچی بگەمە ئاواتی دڵێك کە جگە لە جوانی مەراقی هیچ نیە
ئەی سوخمە فرۆش .. ئەی فڕندە بەنێو سینگی کچاندا .. بەختەوەری لەم سەفەرە بێئامانە ئەبینمەوە یان تۆ بڵێی لەوێشدا سوخمە فرۆشێك هەبێت هەندێ لە جوانییەکانی مەمکم نیشان بدات.؟
تۆ بڵێیێت سوخمە فرۆشێك هەبێت مەمکی بە ئاو و شیری کچانەی دیبێ ؟
من پێویستیم بە حیکمەتەکانتە ئەی سوخمە فرۆش .. من پێویستیم بە فەلسەفە و حیکمەتەکانی شاکارەکان نیە
من دێم و ئەبمە شاگرد لە دوکانەکەتدا و هەزار دێرت لەسەر سوخمە و مەمك بۆ ئەنووسم
هەزار وێنەی سوخمە و مەمك لە دوکانەکەتدا هەڵئەواسم
وائەکەم کچەکان و ژنەکان بە بەرچاوی تۆوە سوخمەکانیان بگۆڕن
من ئێستا ئومێدی هیچ ناکەم جگە لە جوانییەکانی سوخمە فرۆشێك ئەی خوشکە میهرەبانەکەم

دەبا بفرین .. بێ دین و بێ سوخمە بەو ئاواییەدا دەستت بگرم و هەر بە ڕاکردن بڕۆین
بچینە ناو چیرۆکی تابلۆییە پاییزییەکەی جەنگیز ئیتماتۆف و نەگەڕێینەوە
نەگەڕێینەوە ئەم دونیا بۆگەنە بە جوانی
نەگەڕێینەوە ئەم کەونە پڕ فڕندەیە
با بڕۆین بێ نەخشەیەك بۆ جوانی بێ پلانێك بۆ خۆکوشتن و مەلەوانی لە تاڤگەکانی هەقیقەتدا
با بڕۆین عەزیزم با بڕۆین
من هەمیشە لە ڕۆژەکانەوە بەرەو شەو هەڵئەهاتم و لەوێدا لەبەر نووسینەوەی نامەکاندا بە گریانەوە ئەمنووسی
بە قەهرەوە ئەمخوێندەوە
بە عەزابەوە بەدوای تۆ و نوێژ و خوا و ژیان لەسەر کاغەزەکان و دڵی لەتلەتم ئەگەڕام
من ئەو شەوانە ئەمگووت من دڵی لەتلەتی خۆم هەیە بتدەمێ ئەی میهرەبانترین کچ
من ڕوحی شەیدای خۆم هەیە پێشکەشتی بکەم ئەی دڵڕەق

ئەی کائینێك لە مەرگ و ژیان و جوانی و کوشندەیی
ئەمشەو مەراقەکانم گۆڕاون .. ئەمشەو حەزەکانم بەرەو کەنارێکی دیکەی هەبوون شەپۆڵ ئەدەن
ئەی غوربەت وەرە باوەش بکە بەروحم
ئەی غەریبی وەرە بمخۆوە لەناو خۆتدا
من غوربەتێکم ئەوێ لە چاوەکانی تۆدا بمکوژێ
ئای من چەند حەز ئەکەم لەسەر خاکەوە نەمرم
لەسەر جێگەو ڕێگەیەکی نەرمەوە نەمرم
لە ڕێی باخێك و لەباخچەیەکی ترێدا نەمرم
من نامەوێ لەسەر ئەو شەقامانەدا بمرم کە بەردەوام ئەمکوژێ
من نامەوێ لەسەر ئەو ماچانەش بکوژرێم کە بەردەوام ئەمکوژن
ئای زیبا تۆ لەناو ئاگردا تفت لە ژیان کرد و گووتت بمرە ئەی عەشق لە دڵی مندا بمرە
زیبا تۆ و ئاگر مەرگێك بوون لە عەشق و گرێك بوون لە خۆشەویستی
تۆ بە ئاگر تفت لە ژیان کرد و مەرگت راموسی
من نامەوێ وەك تۆش بمرم زیبا ئاوا غەریبانە ئاگر خوێن و عەشقم لە ناو بسووتێنێ
من نامەوێ بە عەشقەوە بمرم و نامەوێ بە شعرەوە بمرم و نامەوێ بە مردنیشەوە بمرم
من ئەمەوێت بمرم مەرگێك پڕ لە چێژ
چێژی گوشینی مەمکێك
بە چێژی مەمکێکەوە بمرم لە کاتی مژیندا
بە چێژی سێکسێکەوە لە کاتی فڕیندا بەناو نەبووندا
من لە نەبوونێك ئەگەڕێم تیایدا شەق لە جوانییەکان و دونیا و مەرگیش هەڵدەم
مەرگێك پێم بڵێ ئەی نابووتییەکانی گوڵ تۆ شایانی ئەو مەرگە جوانە نیت
تۆ شایانی ئەوەنیت بەو چێژەوە وەنەوز بدەیت

ئیدی من تریفەکەم لەم دونیایەدا چیم هەیە لە باوەش و پرچی تۆ جوانتر تیایدا بمرم
من چیم هەیە لە برژانگ و مەمکت جوانتر لەسەری بنووسم
چیرۆکی مەرگ و نەمانی خۆم بنووسمەوە
چیرۆکی دواهەمین چێژی خۆم بخوێنمەوە
من نا تۆ نا
ئەم کەونە نا .. ئەم خوایە نا دولبەرەکەم

هیچ نا

من نزانم بۆ ئەبێت هەمیشە قەهرێك لەو بنی شەوەدا بۆ من هەبێت بیرم بێنێتەوە

زیباکان ئەوەندە زۆرن کە هەرگیز نیشانمان ئەدەن خوا زیاتر مەراقی مەرگە نەوەك ژیان

هەموو رووداوەکان پێمان ئەڵێن خودا هەمیشە دڵڕەقە بەرامبەر مرۆڤ

ئەی خودای میهرەبان بۆ دەبێت لە حزوری تۆدا ناشیرینییەك خۆی بکا بە ژیانمدا بۆ نابێت وەك کورێکی خۆت دڵم بدەیتەوە بە کۆترێك، بە گوڵێك بە پیاسەیەك بە بایەك بە فێنکایەتییەك بە پارچە هەتاوێك

بۆ نابێت خۆشت بوێم و وەك فریشتەیەك هەڵمگریتە هەیوانەکەت زیبا وای ئەگووت و قەترە قەترە ئەرژایە ناو ئاگر

ئەیگووت ئەی خودا ئەی سەروەرم بـۆ نەئـەبوو لـەم کۆڵانـەدا عەشـق لەگـەڵ لاولاوەکـان درێـژ بێتـەوە نـاو ماڵەکەمان

بۆ ئەبوو شەوانە من خەون بکەم بە ملوانکەم و بەیانییان بە پساوی لە سەر جێگەکەمدا هەڵیگرمەوە

بۆ ئەبوو من ببامە چیرۆکی کچێکی سووتاوی ئەو شارە خەمگینانە

بۆ دەبوو ژیان بەو رەنگە بێت و ئەشق بەو ئاوێنەوە بێت و منیش بە ئاگر

منیش لەو شەوەدا ئەپرسم تریفە خان .. گیانی روح و روحی خوێنی من

دەستم بگرە با بایەك پەشیمانم نەکاتەوە لەو سەفەرە و بڵێت وەرە بتبەمەوە بۆ ئەو رۆژەی تۆیان کوشت

ئەو رۆژەی عەشق لە ماڵێکی ئەو شارەدا خۆی ئاشکرا کرد

عەشق لەناو نامەکانی ( دڵبەر ) خۆی خوێندەوە

ئەو رۆژەی با هەموو دەرگەکانی بۆ عەشق کردنەوە و گووتی فەرموو بۆ گۆبەندنانەوە

ئاخر ئەی با دە لێمگەڕێ خۆ من ئـەزانم عەشـقی دڵبـەر .. چـیرۆکێك نـەبوو لـە قەباحەتـەکانی بچـووکترین ئافەریدە گەورە تر بێت

خۆ گوناهێك نەبوو لە گوناهی هەموو پێغەمبەرەکان رەشتر بێت

من لەو رۆژەوە کە دڵبەریان کوشت تا ئێستا بەشێك لە روحمدا ئەگریێ

چاوی پڕبوو لە گزنگ .. دڵی پڕبوو لە رێحان سینگی باخچەی کۆتر و پەپوولەکان بوو

من نزانم وابوو یان نا بەلاّم ( هەندرێن ) وای ئەدیت

رەنگە من وام نەئەدیت.. من بە کچێکی جوانی ئەو شارەم ئەزانی و .. ناسك ناسك .. لە مەکتەبەوە وەك ئاسـك بەرەو ماڵ ئەبۆوە

هەندرێن ئەیگووت نا وەك هەلالّە بەو مەکتەبەدا وەرئەبێت

وەك بخور بە ئاسمانی دڵی مندا ئەسورێتەوە

ئەیگووت .. ئەو کچە کچ نیە نا .. خوایە، ئەوەنیە من عاشقی ئەوم و ئەو قسانە ئەکەم، نا ئەو خۆی خوایــە و گەورەیە، ئەو لە فرِندەیەك ئەکات و منیش دڵم هێلانەی ئەوە، ئەو لە باخچەیەك ئەکات ئەبێت من هەمیشــە بە خوێن ئاودێری کەم، بە گاڵتەوە ئەمگوت کورِە هەندۆ تۆ شەرِ ئەکەیت یان عەشق، ئـەیگووت ئـەی نـاڵێن عەشقیش جەنگە؟ ئەمگووت نزانم عەشق چیە .. ئەیگووت شەنگە عەشق ژیانە .. عەشق دڵبەرە لە تاڤەکانی رۆیشتنیدا .. عەشق دلبەرە لەساتەکانی چاو داخستنیدا .. عەشق ماچەکانی دلبەرە کـە هـەر بەخـەیاڵ لێـی ئەکەم

عەشق دەستگرتنی ئەوە کە هەر بەخەیاڵ ئەیانگرم

عەشق ئەو باوەشەیە کە لەگەڵیدا هەمووخەمەکانی ئەم دونیایە لە بیر ئەکەم

ئەمگووت ئێستا نەمزانی عەشق چی بوو؟ ئەیگووت کورِە عەشق وەسف ناکرێت .. ئەمگووت ئەوەیان قســەی قۆرِە شت هەیە وەسف نەکرێت؟

ئەیگووت دە وەسفی خوێنی با بکە..؟ دە وەسفی رۆیشتنی گزنگ بکـە.. دە باسـی لەرینـەوەی گـەلاَ بکـە بـە باوەشی بادا .. دە باسی رەوتی ئاو کە لە رووباردا .. دە باسی رەنگی ئـاو و سـێبەری باخچـەکان بکـە لەســەر رێگادا

باسی تامی ترێ و مێخەك و مێلاقەکانی هەنار بکە لەسەر کوڵمی یاردا

دە بۆم باسبکە کا چۆن لەو تەئەمولەی نێرگزێك ئەگەیت کە لە بەهاردا ئەیکات .. بۆم بـاس بکـە چـۆن لـە جریوەی ئەستێرەکان ئەگەیت کە باسی کەون و خوا ئەکەن .. چۆن لـە پەیوەنـدی هـەتاو و گـەرمای باوەشـی ئەگەیت

دە بۆم باس بکە جوانییەکان کۆلکە زێرینە چیە؟ پێمبڵێ چێژی شالورێکی شەوانە چیە؟ پێمبڵێ تاریکایی بۆ ئەوەندە بە حەزەوە شتەکان لەناو خۆیدا فەنا ئەکات ...

ئەمگووت دیسان تێنەگەیشتم

تا ئەو رۆژەی دڵبەریان کوشت

ئیدی لەو رۆژەوە بەشێك لە روحی من بەردەوام ئەگرییێت و هەندۆش هێشــتا نازانێـت تەفسـیری ئـەو عەشـقە بکات

تەفسیری ئەو مەرگە بکات و شێت نەبێت .. لەو کوشتنە بگات و هەلا بەهەلا نەبێت

لەو حەلەوە تا ئێستا هەندۆ و دڵبەر و من و روحی شەیدای هەرسێکمان لەگەڵ کوشتن و بکوژەکانـدا پرســیار لەیەك ئەکەن

تۆ بڵێی باخەوانەکانی ئەم شارە گوڵێك بکەن بە نیشتمان

نیشتمانێك بۆ هەر شتێك .. تۆ بڵێی کرێکارێکی ئەم شارە کۆلاَنێك پرِ کات لە تۆزی مەحەبەت .. مەحەبـەت بۆ هەر شتێك

ئیدی من و تۆ شەنگە ئەبێت شەڕێك بکەین کە لەشەڕی عەشق سەختتر بێت
لە شەڕی ژیان و مەرگەکان سەختتر بێت
لە ئێستاوە بۆ ئەبەد شەڕێك لە باخەڵمانەوە خۆی ئەخورێنێ
ئەبێت بڕشێینەوە بە سەر ئەو پەیوەندییانەی لێیان تێناگەین
لەو ئاژاوانەی بە ئێمە تەفسیر ناکرێن
ئەبێت بە برادەرانمان بڵێین ئێوە لە ئێمە سەخیفترن
کە ناتوانن شەڕێك لەگەڵ ئەم دونیایە بکەن
دونیای جوانی ئێوە
ئای دڵبەر تۆ چ تاوسێك بوویت لەسەر ئەو جادانە
تۆ چەند بەزەوق و ئیشتیپاوە ئەو ناوەت پڕ دەکرد لە ڕەنگ و رووبار
چەند نەشمیلانە نازت ئەکرد بە سەر دارو بەرددا
ئەو ناوەت پڕ ئەکرد لە بۆنی پەلکەکانی پاییز و
ئێمەت پڕ ئەکرد لە عەشق.
دەوەرە دڵبەر ئەمشەوە لەگەڵ ئێمەدا غەرق بە لە سەفەر
دەوەرە با سەفەرێکی دیکە بە ئاقارەکانی ئەو مردنەی تۆوە بکەینەوە..
وەك رووبار ڕێ بکەین و وەك با ڕوحمان بدەینە دەست پەلکەکان
دەڕۆین و یادی ئەو ڕۆژانە ئەکەینەوە لە سەفادا ئەگەیشتینە ماچ و لە ماچدا ئەگەیشتینە سەفا
یادی ئەو ڕۆژانە ئەکەینەوە لە مەرگدا عەشقمان ئەکرد و لە عەشقدا ئەمردین
با بڕۆین دڵبەر عەزیزم بڕۆین

من چیرۆکی زۆرم لەوکیژانە ئەناسین کە بە فەتارەت چووبوون، چیرۆکی دەیان شەوی کوشتنی ژن و کچەکان، لە یەکێك لەوشەوانەدا کچێك پڕ بە گەرووی هاواری بە کۆلاّندا ئەگەڕا.. تا سواری تۆمۆبێلەکەیان کرد هەموو کۆلاّن هاتە سەرجادە هەموو جادەکان هاتنە سەر ڕێگا و بەپەلە هاوارەکانیان گواستنەوە بۆ پشت سیپیرێز
مەرگی ئەو کچە لەو شەوەدا زۆر بەساردییەوە خامۆش بوو
چەند هاوارێك بوون کە تائێستاش لە لایەکی ڕوحی مندا سەدایان دێت
من بەخەیاڵی خۆمەوە وێنەی ئەو هاوارانەم ئەکرد کە لە پشت سیپیرێز لە ڕوحییەوە بۆ ژیان ئەهاتنە دەر ئەو ئەیزانی ئەکوژرێت وەك سونبل و وەك شەکرە و وەك گوڵباران و وەك دڵبەر و وەك هەزاران کچی عاشق و ناعاشق.

بێوەژنێك کە بەدەستی باوکەکەی لە بێ ئومێدیدا کوژرا، ژنێك کەلەسەر دەستی خەزووری کرایە تەرم.. زۆر بوون زۆر تریفە چیرۆکی ئەو ژنانەی بە عەشقەوە ئەنووسان و عەشق ڕەوانەی جەهەنەمی خۆی ئەکردن.

بیرم دێتەوە کە گووتم عەشق تاریکترین ساتی من بوو، یەکەم کەس دەسگیرانەکەم لێم نەگەیشت . گووتم گیانەکەم تاریکی هەر ئەوەنیە رەش و تووش بێت وەك شەوی چاوەکانت.. تاریکی تەنها بە ناخۆشی و خەمەوە تەفسیر ناکرێت..

کچێ عەشق ئەوەندە تاریك بوو لە رۆحی مندا کە نەمئەزانی تەفسیری کەم و دیاریکەم.. چرایەکی تێدا نەبوو کەمێك لە ماهییەتی خۆیم بە گۆرانی بۆ بلێت ، عەشق ئەوەندە سەخت بوو بۆ تێگەیشتن پارچەیەك بوو لە نادیار و تاریکی ، کە نە دەست و پەنچەکانم و نە بەروح و خوێنمەوە ئەمتوانی تییبگەم

بۆیە تاریك بوو نەمئەزانی چۆن وا سووك و سانا لەناو ئەچێت و ئەبێتە مەرگ و فیراق و دوورکەوتنەوە و لێکدابڕان .

نەمئەزانی چۆن وێنەکانی ئەگۆڕێت و بۆ دڵبەر و دڵبەرەکان ئەبێتە خەرەندی مەرگ و بۆ من ئەبێتە کۆتایی و بۆ هەندۆش ئەبێتە گەڕان و بۆ ئەوانی دیش وێنەی رەنگاو رەنگ

من بە چێژەوە عەشقم ئەکرد و بۆم تەفسیر نەئەکرا

بە شعر عەشقم ئەکرد و بۆم نەئەنووسرایەوە

لەو سحرەوە گومانێکی تووش تووشی دیتنەکانم ئەهات

لەهەمووی سەختتر مەرگی ئەو پەریزادانە بوو کە ئەیانەویست خۆیان لەناو دڵدارەکانیاندا بنووسنەوە و ببیننەوە و بخوێننەوە

ئەستەم بوو لەو وێرانانەدا بتوانین بەسەر تەرمەکاندا باز دەین و تەماشای ئەو عاشقە کوژراوانە نەکەم

ئەوان کوشتەی جوانی و سەرووچاوی کوڕەکان بوون ، تەماشایان لەسەر ئەو پەنجانە بوو بچێتە مەمکیانەوە

ئیدی دڵبەر تەنیا نەبوو .. تەنیا من و هەندۆش پەنجەکانمان گەورە نەبوون

ئەو حیوارانە نەئەبڕانەوە کە ئەبوونە شانۆ و ئەبوونە قسە و ئەبوونە وتار و ئەبوونە جوانییەکانی دەرەوشانەوەی خۆشەویستی لەناو پەنجەکانی ئێمەدا

من لە بۆشایی ئەمشەوەدا وەك دەیان جاری دیکە ئەمگووتەوە عەشق تاریکە تاریك

تۆ بلێیت لە گوڵدانێکدا عەشق خۆی بکا بە فکرەیەك و خۆی بخاتە سەرکاغەزێکی دڵمان؟

کوشتن یەکێك بوو لەو حەرامانەی لەگەڵ عەشقدا جیا نەئەبۆوە

مەرگ ئەهات و دڵبەر و هەموو فکرەکانی تف ئەکردە ناو جۆگەیەکی پیس و پۆخڵ

لەو سەردەمانەدا عەشق لەو تاریکییەی خۆیەوە نەئەگریا

عەشق لەناو دینەکاندا ئەکوژایەوە و هەلاهەلا ئەبوو

لە روحی عاشقەکاندا ئەسووتا

زیبا لە ئاگردا عەشقی کردە نابووتی

دەسرێژێك لە پشت سپیرێزەوە خۆشەویستی کردە شووشتنەوەی ناموس

ئای لەو پیاوە دڵرەقە کە بە ریشێکی درێژەوە هەموو رۆژ وانەی ترسی بە کچەکانی گەڕەکەوە ئەگووت
سەری زمان و بنی زمانی کفر بوو
حەرام و حەڵاڵی لە حەوشەکەی خۆیدا دابەش ئەکرد
ئەو ئیمامێ بوو هەمیشە رووی لەبەهەشت و حۆری بوو
هەمیشە ئەگریا و ئەپاڕایەوە بۆ بەهەشت
هەمیشە بۆ پەریی و پەریزادەکان ئەگریا و ئەترسا لە نیگای جوانی کچەکانەوە ئەترسا
لە خوا و لە زینا و لە عەشقەوە ئەترسا
ترسێك وەها دایگرتبوو لەگەڵ هەر کراسێکی تەنکدا سەد جار ناوی خوای زیکر ئەکرد
هەزار ئەسحابە و قاتلەکانی تێکەڵ ئەکرد
تەماشاکانی پڕ بوون لە شەرەف و نامووس و ئاوێزانی
ئەو دونیا پڕ بوو لە چێژ .. چێژێك کەتا رادەی مردن لەزەتی ئەدایێ
چێژێك کە تا رادەی کوشتنی دڵبەرەکان دڵی ئەکردەوە
سەیر بوو ئەو پیاوە بەو ریشەوە هەر لەحەوشەکەی خۆیدا دونیای دابەش ئەکرد و ئەیبڕی و ئەیگۆڕییەوە
ئەو ئەیگووت هەموو جوانییەکان قابیلی تەماشا نین
داپۆشن ئەو پارچە گۆشتە چێژبەخشانە
ئەوانە لە کوفرێکەوە سەرچاوە ئەگرن کە شەیتانیش پەییان پێ نابات
ئەوانە خوا لە روحیاندا مردووە و شەیتان زەفەری پێ بردوون
هەزار سەڵاواتی لە دیداری محەمەد لێئەدا و ئەیگووت بەسکەن سۆزانی
هەزار جار خۆی بە قوربانی محەمەدی ئەلموستەفا ئەکرد و ئەیگووت لەدەوری کفرەکانتان مەسوڕێنەوە
لەدەوری سەری محەمەدەوە هەزار جار خۆی بە کوشت ئەدا و ئەیگووت من هیچ نامکوژێ لەو دونیایەدا خەمی ئەو کوڕو کچە عاشقانە نەبێت
من هیچ نامباتە جەهەنەم ماچ و تێکەڵبوونی ئەو دامەن پیسانە نەبێت
من هیچ نامکاتە قەترەیەکی شەرمەزاری نامەی ئەو دڵدارانە نەبێت
بەسکەن ئەی بەنی ئادەم بیرتان بێتەوە ئێوە نەوەی دینێکن کە پڕە لە جوانییەکانی ئاخیرەت
کە پڕە لە چێژ و شەهوەتی ئەو دونیا
دەمارێك لە پیاوەتی بکەن بە خوێنتانەوە هەڵیگرن لە قیامەتدا پێی بچنە بەهەشت
من ئەو شەوە گووتم تریفە : ئەو هاوارە لەو کۆلانەدا نابێتەوە، تا دونیا ماوە و ئەو کۆڵانــە نەعلەتییــە مــاوە و ئەو ئیمامە پیسە ماوە ئەو هاوارە هەر ئەزریکێنێ و خۆی ئەکا بە روحمــەوە، هــەر داوای ماچــەکان ئــەکات و لەدوای کوڕێك ئەگەڕێت، ئەو هاوارە نە ماندوو ئەبێت و نە عارەقە ئەکات .. وەك ئەو پیاوانەی غەرق بوون لە

عارەقە لەو شەوە ساردەدا و ئەو گولەیان کوشت، گــووتم ئــەو هاوارانــە ئــەمکوژن تریفــە ئــەمکوژن.. کچــێ ئەمکوژن، گووتم ئەو ئیمامە دڵم پڕ ئەکا لە ناشیرینی .. دڵــم پــڕ ئــەکا لــە وەحشــەتی دیــن و گووتارەکــانی نامووس، چی بکەم تریفە لەم شەوە بێئاماں و بێڕەحمەدا چی بکەین؟

ناکرێت تا بەیانی لەگەڵ ئەو هاوارەدا بگرییم و بەیانیش هەر لەگەڵ ئەو هاوارەدا بگریێم و بگرییم

تا ئێستاش خوێن لە رۆحی هەندۆ بۆ دڵبەر ئەڕوات و تا ئێستا ش بەشێك لە روحی منەوە بۆی ئەگرییێت

ئەی روح .. ئەی خەزنەی گریان و فرمێسکە ئاڵەکانی خۆت، ئەی پۆستەی بای ئەجەلی نامورادەکان

ناکرێت بەو هەموو گریان و برینانەوە روح بگاتە بەردەمی گوڵدانێکی نازناز و دڵی خۆش بێت

ناکرێت لەبەردەمی گۆرانییەکدا بگاتە سەفا

ناکرێت لە گاڤێکی رۆشناییدا بگاتەوە خۆی

ناکرێت نا ، لەم شەوە تووشانەدا دەربازبێت و لەوتاریکییەی عەشقدا پەلێك بە ئیمانێکەوە بکوتێت

ناکرێت نا .. ئەو روحە پەژمووردەیە ناگاتەوە مەڵبەندەکانی جوانییەك لە پشت ئەو چیایانەوە

ئەو رۆژانە بەسەر چوون چیا رەمزی بەرگری و پەنا بێت

ئێستا ئەو چیایانە هاواری دڵبەرەکان وەك ئاو ئەخواتەوە و ئەیانباتە قوڵترین دەماری خاك

دەمارێك کە هەرگیز ئامادەنیە قەترەیەك لەو هاوارانە بداتە دارێکی تێنوو

ئیدی روحم هەلا و گیانم پەرپووت

من ئەوەتام شەیدا بەجەستە و بەروح و هاوارەکانییان

من لەهاوارەکانی جەستە و لێو و مەمکەکان پڕم

پڕم لە برینەکانی روح و برینەکانی خوێن

من لەناو چیدا کاربکەم ( زانۆکە )

کە لەهەموو لایەکەوە گەمارۆ ئەدرێم؟

من لەناو چیدا بفڕم .. لەناو جەستەی ملیۆنێك تریفە و زیبا و دڵبەر

یان لەناو ئەو برینانەدا کە ئاسمانیش دایانناپۆشێ

من لەناو چیدا بگەڕێم .. لەناو قەتماغەکانی سەر برژانگەکان یان لەناو رووباری خوێنی کچەکانم

من تەواو گیانە تەواو

ئەبێت راکەم لەدەست ئەو هەموو گورگە برینانە

ئەبێت سەرهەڵگرم و ببمە غەییدۆست

غەییدۆستێك کە دەستی نەگا بەهیچ زانینێك

کە چاوی نەکەوێتە سەر هیچ مەعلومێك

کە نەگاتە فڕین بە باڵەکاندا

نەگاتە رووناکی بە چراکان

نەگاتە هاژە لە رووبارەکاندا

غەیبدۆستێك بە هیچ نەگات .. هیچیش نەبێتە سەرمایەی لە سەرمایەکانی جوانیدا

نەبێتە بەردێك لە بەردەکانی زیکر و وەفادا

نەبێتە حەلقەیەك لە حەلقەکانی گزنگ و سەفادا

من نامەوێ ئیدی بەو هەموو دڵسووتانەوە هەر بەیادی پیاسە بێزارەکانی شـەقامەکاندا بـەدەم جگەرەیەکـەوە بسووڕێمەوە و لە ئەردێکدا نەکەوم

ئیدی با بیرم نەیەتەوە بۆ ئەبەد

من کوڕی کامە کاولە گوند و خاوەن هەقایەتی چەند خۆشەویستی بووم

با بڕۆین عەزیزم با بڕۆین بێزار لە گەمەکانی جەستە و کارەکانی روح

با بڕۆین پیرە خاتوون بۆ دونیایەك پڕ بێت لە غەیب

با بڕۆین و خۆمان لە برینەکانی دڵبەر و کاوێس ئاغا و شعرەکانی مەولەوی بێنین

با بڕۆین لەوێدا بە هومێدێکەوە جگەرەیەك داگیرسێنین

هومێدێك لە هیچی باران و تووڕەبوونی بەفر

ئیدی لە ئێستاوە بۆ ئەبەد لێرەدا ئێمە ناتوانین پێناسەیەك بۆ گیان و بۆ جەستە و بۆ گوڵ بکەین

لێرەوە بەدواوە ئێرە نابێتە خاکی هیچ ناوێك

ناوەکان لێرەوە بەسەر یەکدا ئەمرن .. مردنێك کە هەر لە نابووتی ئەکات

لێرەدا پێناسەکان بەیەکەوە ئەسووتێن . سووتانێك جگە لە بێمانایی هیچی دی ناداتە ژیان

لێرەوە هەقایەتی برادەرەکانم چەند ناشرین دێنە پێش چاو .. ئەو برادەرانەی ئەیانتوانی بە ئاسانی درۆم لەگـەڵ بکەن و درۆ لەگەڵ ژنەکانیان بکەن و درۆ لەگەڵ خۆشیان بکەن..

شەوێك بوو لە شەوەکانی پاییز، من ئەمزانی جەستەی ژنە برادەرەکانم بۆ ماچـێك ئەسـووتێن و بەماچـێکیش سەوز ئەبنەوە ، من ئەمزانی ئەوان مەمکیان ئەکەنە لیمۆ بەسەر جەستەی برادەرەکانمدا و تا روح تام و شـیر و ئاویان ئەدەنێ.. تا خوێن لەزەت و چێژئەکەن بە دەمیاندا

بەڵام ئەوان لەو شەوە پاییزییەدا .. دوور لە باوەشی ژنەکانیانیاندا کۆڵانێکیان پڕکردبوو لە بۆنی زینا..

کۆڵانێکیان پڕ کردبوو لە عەتر و لە کانیلەی سێ کچ .. ئەوانەی رۆژانە ئەکوژرێن .. سێ ژن ئەوانـەی رۆژانـە ریسوا ئەکرێن.. سێ ژن ئەوانەی رۆژانە جەنگی ژیان و جەنگی نان و جەنگی گان ئەکەن

سێ ژن رەنگە لە تاقی دونیادا تەنیا و تەنیا شەو شك ئەبەن تا پڕی کەن لە بۆن

تەنیا شەو شك ئەبەن تا بە جوانییەکانی ئەوانەوە خۆی کرێت کات

ئەی شەو .. چەند جوان بوویت بەو ئەستێرانەوە میهرەبانییەك بدەیتە ئەو سێ ژنەوە..

لەو شەوە پاییزییەدا برادەرەکانم .. کە ژنەکانیان لە حەژمەتانا مەمکیان ئەخستە دەمی منداڵەکانیان و دەستیان ، ئەوان کۆڵانێکیان سەرخۆش کردبوو بە بۆنی زینا

ئەوان لە کانیلەی ئەو سێ کچەوە جەستە و هەناسە و پەنچە و شەرم و ژیانیان ئەدزی

ئەوان لە شەوێکی پاییزیدا .. کۆڵانێکیان کردبووە دزێخانە

لەو لاوەش سێ کۆڵانی دیکەی پاییزی زیاتر بە پاییزی جەستەو روحەوە زەرد ئەبوون

روح و کۆڵان و جەستەکان وەك یەك خەزان لوولی ئەدان و

برادەرانیش بێباك لەو پاییزەی ژیانی ئەپێچانەوە، بێباك لەو خەزەڵوەرەی بەربووە روحیان و لەسەر جەستەی کچەکانەوە رەنگی پاییزییان ئەگۆڕی

ئیدی گووتم هەندۆ تۆ لەکوییێت تا عاشقانە باسی پاییزم بۆ بکەیت و سەرمەستانە خەزەڵوەر بکەیتە بەر بەرگی دەفتەرێکم

رەفیقێك هەبوو حەزی لە پاییز بوو ، حەزی لێبوو هەمیشە لەناو پەلکە زەردەکاندا وێنە بگرێ و رەنگ و روحی خۆشی بکاتە پەلکێکی زەردی پاییزی هەڵوەریو

پەلکێك کە با بەکەیفی خۆی بیهێنێت و بیبات

پەلکێك کەهیچ یادگاری و خوێن لە روحیدا نەمابێت و بەو مردنییەوە جادەیەك یان جۆگەیەك جوان بکات

ئەو مەراق بوو جوان بێت .. مەراق بوو وەك پەلکەکان بە روو زەردیشەوە جوان بێت

ئای برادەر لێرە نەبوویت .. لەو کۆڵانە بێهۆشەدا پەلکێك هەڵگریتەوە و بە برادەرەکانمان بڵێیێت ئێوە هەندەی پەلکێکی زەردیشەوە خوێنتان نیە، ئەوەندەی پەلکێکی زەردیش جوانیتان نیە

ئیدی ئەبوایە من لەو شەوەدا بیرم لەسەر مەمکی ئەو ژنانە بێت کە لەبن دەستی منداڵەکانەوە بێتام ئەچووە خەو

بێ سۆزی لێوی پیاوێکی گەورە ئەنووست

من ئیشم بەو جەستانە بوو .. ئەوانەی لە کۆڵانێکدا بێتام بەسەر پەنچەکاندا بۆنیان ئەڕژا و ئەو مەمکانەی بێناز لە کۆڵانەکانی دیدا بەسەر سینگدا شۆڕئەبوونەوە

ئەو جەستانە هەموویان ببوونە پایز و هەموشیان حەزیان لە خۆکوشتن و گریان بوو

جەستەی ژنەکان و جەستەی سۆزانییەکان .. سەیر بوو من لە روحی ئەو برادەرانە نەئەگەیشتم بۆچی بخور لە سەر سینگی ژنەکانیان هەڵناکەن و ئاگر لە سینەی سۆزانییەك ئەکەنەوە؟

تێنەگەیشتم ئەو گەمەیە بۆ ئەوەندە بێ میهر بەڕێوە ئەچێت؟ ژیان بۆ ئەوەندە هاودژانە ئەڕوات؟

تریفە پێی گووتم کە رۆیشتین من حەز ئەکەم دەفتەری یادگارییەکانی ( قەتمەر ) لەگەڵ خۆم بێنم

ئەو هەموو شتێکی تۆمارکردبوو ، چیرۆکی دەیان برادەری وەك تۆ و دەستە خوشکەکانی.

ئەو دەستە خوشکانەی کە ژیانیان زیاتر شانۆیەکی تراژیدی بوو نەوەك تەمەنی کچۆلانێك و ژنانێك کە بەیانییان زوو هەستن و تێشت بۆ پیاو و مێردەکانییان حازر کەن

ژیانی هەندێکیان زیاتر لە تەموومژ ئەچوو کە هەندێجار نەئەکرا رووی دەستەخوشکەکانی قەتمەر ببینی

قەتمەر چیرۆکی هەموو ژنەکوژراوەکانی تۆمار کردبوو و وەك خۆیشی نووسیبووی هەر هەموویان دەستە خوشکی ئەوبوون، هەر هەمووی بە شێوەیەك لە شێوەکان دیبوون و ناسیبوون و قسەی لەگەڵ کردبوون.

رۆژی کوشتنی هەموویانی تۆمارکردبوو و یان ئەوانەی ئاگریان لە خۆ بەردابوو

گووتم تریفە چی لەویادگارییە خوێناوییانە ئەکەیت لە غەیبستاندا؟ گووتی روحی قەتمەر لەو دەفتەرەدایە نامەوێ دەستی کەسی بگاتێ .. ئەوە ئەمانەتی ئەوە بۆ من کە رۆژێ لە رۆژان بیکەمە چیرۆك یان رۆمان یان هەر شتێك.

قەتمەر نەیویستبوو ئەو رووداوانە وەك خۆی بچنە بن خاك، بە تریفەی گووتبوو ئەوانە هەڵگرە بۆ رۆژانێك کە لە ئێستاوە بە میهرتر بێت. رۆژانێك کە مرۆڤ بۆ ئەو کچ و ژنانەوە بگرییێت نەوەك تفیان لێبکات. هەڵیانگرە بۆ سالآنێك کە لەوێدا کەسێك هەبێت بە عەشقەوە قسە بکات

هەڵیانگرە و با بزانن رۆژانێك قەتمەرەکان چەند لەدەست جەستەوە وەرس و بێزار بوون و هەر بە جەستەشەوە سەریان نایەوە.

چیرۆکی قەتمەر چیرۆکی جەستە بوو .. چیرۆکی وەرز و ساڵ و دەم و شەو و رۆژەکان نەبوو، بێ ئەوەی ئەو خۆی مەبەستی بووبێت سەربوردەی دەستەخوشکەکانی سەراپا جەستە بوون، چیرۆکی کۆمەڵە عەشقێك کە هەر هەموویان بە فەنابوونی جەستە برابوونەوە.

( نارین ) ئەو شۆخە بوو کە لەگەڵ برای مێردەکەی هەمیشە لە سووتاندا بوو، ئەو حەزی لەو بوو کەچی بەزۆر دایان بە براکەی، بەلآم نارین جەستەی ئاگر بوو و تەنیا بۆ ئەو ئەسووتا، دەیان شەو تێکەڵی ئەو جەستەیە ئەبوو کە ئەو حەزی لێبوو، ئەو جەستەیەی کە هەستی ئەکرد لەگەڵ ئەودا ئەگاتە ئەوپەڕی نەشئە و خۆشەویستی، ئەوەیان عەشقێك بوو کەسیان بەرزەفتی نەئەکرد نە نارین و نە عاشقەکەی، ئەوان بۆ یەك خولقابوون ، بۆ یەك خۆیان ئەشووشت وخاوێن ئەکردەوە، خۆشترین گوڵیان ئەکردە باخەڵی یەك، جوانترین هەناسەیان ئەرژاندە بن گوێی یەکدی، شەوان هەبووە تا بەیانی بەس یەکدیان بۆن کردووە، شەویان تەنیا بە بۆن کردنی جەستەی یەکدییەوە بردۆتە سەر، شەو هەبووە تەنیا و تەنیا تەماشای جەستەی رووتی یەکدیان کردووە، بێ ئەوەی دەست لە یەکدی بدەن، شەو هەبووە تا بەیانی بۆ یەك چرکەش لە ئامێزی یەکدی نەبوونەتەوە، بە دەیان جار کە مێردەکەی بەیانییان زوو ئەهاتەوە ماڵ ، هێشتا عاشقەکەی لە ژوورەکەی ئەو بووە و هەمیشە موعجیزەیەك دەربازی کردوون. ئەوان بە دەیان و سەدان شەو فرمێسکیان لەسەر برژانگ و برۆ و گەردەنی یەك هەڵرشتووە و فرمێسکەکانی یەکدییان خورادۆتەوە ، بە دەیەها جار هەر لە بنی پێوە تا هەنییەی یەکدییان ماچ کردووە، بەدەیان شەو کوڕە تەنیا پرچی نارینی بۆن کردووە و ماچی کردووە، ئیدی

جەستەی ئەوان چەندین ساڵ تەنیا و تەنیا بۆ یەکدی جوان بوونە و گەشاونەتەوە، تا لەشەوێکی نەعلەتیدا کەهیچ موعجیزەیەك فریایان ناکەوێت، مێردەکەی هەر بە رووتی جەستەیان بۆ دوا جار تێکەڵ بەخوێنی هەردووکیان ئەکات.

قەتمەر نووسیبووی ئەو خۆی دیبووی کە خوێنی هەردووکیان تێکەڵ بەیەك بوون و کەس نەیئەزانی کامە خوێن هی نارینە و کامەشی هی عاشقەکەی.

ئیدی ئەویان چیرۆکی جەستەیەك بوو کە بەهیچ لێك نەئەکرانەوە و هەمیشە بەرامبەر یەکدییەوە سەرسام بوون.

نارین بۆ قەتمەری باس کردبوو ، بەددیان شەو یەکمان هیچ قسە ناکەین و تەنیا لەیەکدی رادەمێنین ، بێ دەنگ و بێ قسە، تەنیا زمانی جەستە نەبێت، ئەوانی کردبووە عاشقێك کە تێربوون نەزانێت، کە هیچ شتێك نەناسێت ، نە روح و نە برا و نە مرۆڤێکی دی.

ئەوەیان بەسەر هاتێك بوو، کە لەگەڵ دەستەخوشکەکانی دیکە جیاوازی هەبوو، باسی خاتوونی کردبوو کە بەعەشقی زاواکەیانەوە ئەوەندە نەخۆش بوو تا رادەی مردن، ئەو هەرگیز ئەو کوڕەی نەدیبوو تا نەبووە زاوایان، ئەو شەوانەی زاوا و خوشکەکەی لە ماڵی ئەوانەوە ئەنووستن خۆشترین ساتەکانی ژیان بوو، بەتایبەت لە شەوانی هاویندا کە هەموویان لەسەر بان ئەنووستن و ئەویش لە خوارەوە بە فرمێسك و ترس و لەرزینی مەمکەکانییەوە چاوەڕێی ئەکرد. قەتمەر نووسیبووی کە خاتوون ئەڵێ هەر کە دێنە ماڵمانەوە ئیدی من هەموو جەستەم ئەلەرزێ ، هەر هەمووی بەتایبەتی مەمکەکانم کە هەست ئەکەم لە سینگم جیا ئەبنەوە، تا ئەو کاتەی دەستی ئەو کوڕەی ئەگاتێ ، ئەوکاتە مەمکەکانم کڕ ئەکەون و وەك پشیك لە ناو لەپەکانیدا خۆیان کڕ ئەکەن و لێئەگەڕێم بەکەیفی خۆی یارییان پێ بکات. ئەو ساتانە خۆشترین ساتەکانی چێژی جەستەیە، ئارەقە و شیلەی گەردەنی من و لەپەکانی ئەو وەها تێکەڵ بەیەك ئەبن کە نازانم ئەوساتانە روحم لە کوێیە؟ نازانم خۆم جەستەم لە کوێیە تەنیا ئەوەندە ئەزانم لەگەڵ ئەودا لە ژێریدا شل شل و نەرم نەرم و جوان جوانم، تەنیا ئەزانم لەشم تەڕ ئەبێت و ئارەقە ئەکەم ، بۆن لەجەستەم ئەڕژێ و ئەویش بە هەموو کەلەخییەوە ئاوێتەم ئەبێت. بەناو ئەودا رووئەچم، ئەچمە ناو لەشی ، کە گوێچکەم ئەگرێ و ئەمژێ ئەڵێم ئێستا لە دەمی ئەودا بزر ئەبم، ئەوەندە خۆشە کە هەست بە فەراغێك ئەکەم، نزانم لەوشەوانەدا دونیا ئەوەندە رووناك ئەبێت وا ئەزانم هەزاران چرا لە ژوورەکەمدا هەڵکراون، هەر جەستەی من و ئەو خۆیان ئەبنە چراخان.

قەتمەر نووسیبووی من بڕوا بەقسەکانی ئەو ئەکەم، پێموایە هەر ئەوەش لەوشەوە گەرمەی هاویندا ئەوانی کەشف کردبێ، رەنگە هەر ئەو شۆقە بووبێت خوشکەکەی بەدوایدا هاتبێتە خوار و بینیبێت کە مێردەکەی خەریکی دەسبازییە لەگەڵ خوشکەکەی و خۆی پێڕانەگیرابێت و کردبێتیە هاوار و دوایش خاتوون بە پەلە رایکردبووە حەمام و هەر لەوێدا پێش ئەوەی باوکی و دایکی و ئەوانەی دی بگەنە خوارەوە ئەو جەستەکەی لەناو ئاگردا دوا ئارەقەی خۆی رشت و تا بووە خەڵوزیش کەس نەیکوژاندەوە.

خاتوون بە ئاگر لە جەستەی خۆی و ئەو ژیانە هەڵات، بەو خۆسووتاندنە نەیهێشت کەسی دیکە دەست لە پرچ و برۆ و برژانگەکان و مەمکەکانی بدات، خۆی کوشت و بەمەوە نەیهێشت کەس تفێکیشی لێبکات، ئەگەر چی دوای بەخەڵوزبوونیشی تفی لێکرا، بەڵام تفەکان نەکەوتنە سەر ئەو جەستەیەی کە چرا خان بوو.

قەتمەر پێی وابوو خوشکەکەی تەنیا لەرقی جوانییەکانی جەستەی خاتوون لێی کردە هەڵڵا نەوەك لەبەر ئەوەی لەگەڵ مێردەکەی ئەو دەستی تێکەڵ کردبوو، ئەو حەسوودی بە جەستەی ئەو ئەبرد، کە زانیشی ئەو ناتوانێ ئاوا وەك ئەو شەوق بدات بۆیە ویستی بیکوژن، بەڵام ئەو خۆی خۆی کوشت.

قەتمەر بەقسەش بە دەستە خوشکەکانی گووتبوو، جەستە چرای خۆی هەیە، جەستەی هەر ژنێك تەنیا بۆ پیاوێك دائەگیرسێ. تەنیا بۆ پیاوێك شەوق و نور ئەدات. درۆیە جەستە بۆ هەموو پیاوێك خۆی رووناك کاتەوە. ئەو ئەیگووت دەستەخوشکەکانی من زۆربەیان ئەو ژنانە بوون کە لەگەڵ مێردەکانیان بێ چرا بوون، چونکە مێردەکانییان ئەو کەسانە نەبوون کە بزانن سەرچاوەی رووناکی ئەوان لە کوێیە. ئەوان لە زمانی جەستەی ژنەکانییان نەگەیشتبوون، بۆیە کە ئەوانیش ئەو پیاوانەیان ئەدۆزییەوە نەیانئەتوانی دەست بە رووناکی خۆیانەوە بگرن. رووناکییەکە ئەو رێیەی نیشان ئەدان کە تیایدا گەڕانەوەی بۆ نەبوو. ئەوان رێیەکیان هەڵئەبژارد هاتونەهات نەبوو، تەنیا نەهات بوو، ئەوە رێگەی جەستە بوو، پەیوەندی بە هیچی دیکەوە نەبوو.

قەتمەر خۆی کە ئەو رووناکییە مەحفی کردەوە، زۆر جوان لە هەندێ لە لاپەڕەکاندا باسیکردبوو کە چۆن ( ئولفەت ) لەگەڵ سێ پیاو تووشی ئەو حاڵەتە بووە ، ئولفەت خۆی مێردی کردبوو بەڵام زوو مێردەکەی مردبوو و تەنیا منداڵێکی لێی هەبوو، ئەو بە قەتمەری گووتبوو کە پیاوەکەی ئەو کەسە نیە کە جەستەی بۆی بگەشێتەوە، تا مردیش یەك تاقە شەویش رووناکیم پێ نەبەخشی و رووناکی نەدامێ. بەڵام پیاوێکی دیکە ئەوەندە مەراق بوو بە من شەو نەبوو لەبەر دەرگەمان تێنەپەڕێت و تا دواییش خۆی کرد بە جیرانمان، هێشتا مێردم مابوو کە بە بەرچاوی ئەوەوە هەندێجار قسەی شیرینی پێ ئەگووتم، بەڵام دوای مردنی ئیدی شەو نەبوو لەدەرگەم نەدات و لە پشت دەرگاوە چەندین شەو وەك منداڵان و لە ژنانیش خراپتر بۆم ئەگریا، تا دەرگەی لێبکەمەوە، ئەیگووت خۆشم ئەوێیت و لێبگەڕێ با بێمە ژوورێ. تا ماوەیەکی زۆر هەموو جار پێم ئەگووت بڕۆوە لای ژنەکەت. سەد جوێنێ بە ژنەکەی ئەدا و بە قوربانی منی ئەکرد، ئەیگوت تۆ ژنی منیت! لەوەتەی تۆ ئەناسم نامەوێ هەرگیز لەگەڵ ئەو بنووم ، باسی جەستەی منی ئەکرد، منیش لە پشت دەرگاوە هەموو جەستەم ئەبووە چێژ تاوای لێهات بڵێم بڕۆوە ناو باوەشی ژنەکەت، ناو مەمکەکانی ئەو بڕۆ لەگەڵ ئەو ئاوێتە بە، تەنانەت دوایی هەموو قسەیەکمان ئەهاتە سەر زمان ، جارێ بە گریان و جارێ بە هەڕەشە و جارێ بە پاڕانەوە و هەر جارەی بە شتێك و هەر شەوەی بە جۆرێکەوە وازمان لەیەك ئەهێنا، بەڵام تا شەوێکیان ئەوەندە گریا لەپشت دەرگاوە سوێندی خوارد کە دەرگاکە بەرنەدا ئەگەر دونیاش خراپ بێت، ئەگریا و دەنگی گریانەکەی لەشەوانی دیکەوە بڵندتر بوو، ترسی جیران و خەڵکانم هەبوو، هەمیشە ئەو ترسەم هەبوو بەڵام ئەو شەوە زۆر ترسام، ئەوەندەی لێپاڕامەوە سوودی نەبوو، تا بەرەبەیان هەر نەڕۆیشت دوایی پێموایە من لە پشت

دەرگاوە و ئەویش لە پێش دەرگاکە خەومان لێکەوتبوو، لەگەڵ دەنگی مەلا بە ئاگا هاتمەوە، نوزەیەك لە پشت دەرگاوە ئەهات، زانیم نەڕۆیشتووە، دەرگاکەم کردەوە، یەکسەر هەڵسایەوە و خۆی کرد بە ژووردا، پێمگووت کابرا ئەوە کار نیە تۆ ئەیکەیت، دەستم بە گریان کرد، ئەویش هەر بەگریانەوە خۆی تێکردم و گەردەنی پڕکردم لە ماچ، من ئەو ساتە چێژی یەکەم ماچ رژایە گەردەنمەوە، هەر گووتیشم وا مەکە منداڵەکەم نووستووە و بەئاگادێ، ئەو هەر بەگریانەوە ماچی ئەکردم، منیش هەر بەگریانەوە ئەمگووت وامەکە، ئەویش هەر بەگریانەوە خۆی بەقوربان ئەکردم و ماچی ئەکردم، ئەگریام و چێژیش ئەچووە خوێنمەوە، ئەویش ئەگریا و هارانەتر ماچی لێئەکردم، گووتم راوەستە توخوا راوەستە، بەڵام رانەوەستا و هەر بەگریانەوە مەکسییەکەی لەبەر کردم لەسەر جێگاکەم درێژبووین و ئیدی من رووباری فرمێسك لە چاوانم ئەهاتنە خوارێ و ئەویش بە گریانەوە گەمەی بە جەستەی من و خۆیەوە ئەکرد، ئای خوایە ئەو بەرەبەیانە چی بوو؟ ئەو هەموو فرمێسك و چێژ و لەززەتە لە ئێمە ئەڕژا، تا هەردووکیشمان تەواو بووین گریانمان هەر ئەهات، هەر بەگریانیشەوە رۆیشت و منی بە گریانەوە بەجێهێشت. من ئەو رۆژە رەنگە تا ئێوارە هەر گریابم و دڵخۆشیش بووم، بەوەی دوای ماوەی زیاتر لە ساڵێك دیسانەوە دەستی پیاوێك کەوتەوە سەر جەستەم. فرمێسکم لە چاو ئەهاتە خوار و سەرسامیش بووم بەو کارەوە.

ئیدی ئەوە بووە سەرەتای جەستە گۆڕینەوەمان ، دەیان و سەدان فرمێسك و ئاه و ناڵەی دیکەمان لەگەڵ یەك گۆڕییەوە و تێکەڵ کرد.

ئیدی لەوێوە من جەستەم کرایەوە و دەستی بە چرا وەشاندن کرد، تا ئەهاتم زیاتر و زیاتر بەو چێژەدا وەرئەبووم، جەستەم هەر شەوەی تامێکی نوێی ئەدامێ، ئەو پیاوە فێری کردم چۆن جەستەی پیاو بپەرستم، چۆن خۆی بە قوربان بکەم، کە ماچی ئەکردم دەیان جار خۆم بە قوربان ئەکرد، لەوە خۆشتر نەبوو مەمکەکانم توند توند بگرێت و تەڕییان کات بە ئاوی لێو و دەمی و هەموو کونیلەکانی لەشم بە پەنجە و بە لەشییەوە داخات. ئەمگووت هەموو کونیلەکانی لەشم بگرە، دەمت بنێ بەسەر دەممەوە، لێمەگەڕێ هەناسەم بێت با لەناو تۆدا مەلە بکەم، بفڕم.

خۆشبوون ئەو شەوانە کە تەمەنێکی منیان لەتەنهایی رزگار کرد، تا ئەو کابرایە نەکوژرا من جەستەم بێ شەوق نەبوو، نزانم تا ئێستاش نزانم لەسەر چی کوژرا، لە تازییەکەی ژنەکەی هەزار سەردولکەی بەسەردا گووت بەڵام نەیتوانی یەك دێر بۆ دەست و جەستە شەهوانییەکەی بڵێت، نەیتوانی باس لەو پەنجانەی بکات کە چەند بەتامەوە مەمکی ئەگرت، یان باسی ئەو ئاوەی بکات کە ئەیخستە دەمانەوە، من زۆر شەوان پرسیارم لێ ئەکرد ئەمگووت تۆ لەگەڵ ژنەکەشت وا ئەکەی ئەو حەزی نەئەکرد زۆر باس لەوە بکات و ئەیگووت تۆ ژنی منیت، بەڵام هەندێجاریش لە رازانەکانی دوای تەواوبوون و شەکەتی جەستەدا بەدەم جگەرە کێشانەوە ئەیگووت، ئەو وەك تۆ هەتاو نادات ئەو نایەڵێت هەموو کونیلەکانی تەڕ کەم، نایەڵێت وەك سێو بیخۆم، ئەو بێ زەوقە، جەستەی پڕ نیە لە حەز و ئیشتیبا. ئەو وەك تۆ نیە، ئەمگووت بۆ من چۆنم، ئەیگوت عەزیزەکەم

مەکر بکە بەسەرمدا، بەو مەکرانەوە ئەوەندەی دی جوان ئـەبیت و تـام ئـەدەیت، خـۆی و دوکـەڵی جگـەرە و هەناسەکانی ئەخستە دەممەوە، ئەیگووت تۆ ژنیت ژن!

تا نەکوژرا من نەمزانی ئەوەندە تەنیام لەم دونیایەدا، نەمئەزانی جەستەم ئەوەندە تاریکـە بـێ ئـەو، تـاریکی مەمك و گەردەن و هەموو لەشی داپۆشیم. شەوان ئەبوومە پارچەیەك لەزەت و قەهر و عـەزاب و خۆشەویستی بۆ پیاوێك، زۆر یادی ئەو پیاوەم ئەکرد و حەزم ئەکرد هەمیشە بمابایـە، هەرچـەندە مـن وەك ئـەو قـەت ئـەو هەستەم نەبوو کە مێردمە، بەلاّم کە مرد تاریکی و تەنیایی رایانپێچامە جەهەنەم.

من خەفەتی مردنی ئەوم ئەخوارد ، بەلاّم هەمیشەش خەمی تاریکبوونی جەستەم زیاتر ئەیکوشتم.

پیاوانی دیکە زۆربوون کە بە ئاشکرا داوای تێکەڵبوونیان لێ ئـەکردم و مـنـیش هـەر جـارەی بـە رەنگێکـەوە حەزەکانم ئەکوشتن و دەستم نەئەدایە کەسیان، تا ئەوکاتەی پیاوێك وەك پیاوەکـانی دونیـا ،مامۆسـتایەك لـە پەرێکی دونیاوە هاتبووە شارەکەمان، نازانم لە کوێوە بۆم پەیدابوو ، جەستەم بوو مـن نـەبووم دەرگـەکانم بـۆ کردنەوە، هاتوو باوەشی پێمداکرد و بۆنێکی سەیری رژاندە هەناسەم, گووتم ئەوە چ بۆنە؟ گووتی بۆنی عارەقە.

گووتم ئەشخۆیەوە؟ گووتی حەزئەکەم لەسەر سینگی تۆدا بینۆشـم. لـە شـەوانی دیـدا عـارەقی ئـەکردە نـاو مەمکەکانم و ئەیلێستمەوە، و ئەیلێستمەوە و زیاتر مەست ئەبوو ئەیگووت نزانم کامەی سەرمەستترم ئەکـەن، تۆ یان ئەو نەعلەتییە؟

ئیدی چیرۆکی من لەگەڵ ئـەودا بـووە بەشـێکی دیکـە لـە روح و لـە خـوێن و لـە ماڵەکـەم. گـەلێ شـەوان بەسەرخۆشی ئەهات و من و عارەقی ئەکوشت بە شەهوەتێکی سەیر، ماندوو نەئەبوو و دەیان شـعر و گـۆرانی بۆ ئەخوێندم، ئەیخواردەوە و ماچی ئەکردم تا دوایی منیشی فێر کـرد لەگـەڵی بخۆمـەوە، ئـەو زەقنـە بووتـەم ئەخواردەوە و تا پێمانکرابا لە تاریکی و بە بێدەنگ پێئەکەنین، بەسەر گەرمییەوە تێکەڵی یەك ئـەبووین، تـا شەوێکیان گووتی برادەرێکم هەیە زۆری حەز لێیە شەوێك بێت ئەو بەزمە ببینێت؟ گووتم نا و شتی وانابێـت.. کەچی چەندین شەو دووبارەی کردەوە و دواییش لە شەوێکی سەرخۆشیماندا برادەرەکەشی گەیشتە سـەر روح و جەستە و هەناوم، فێربووم لەگەڵ هەردووکیان پێکەوە بچینە ناو دونیای سەرخۆشـی و مەسـت بـوون لەگـەڵ عەشقدا، دەیان جار ئەمگووت عاقیبەت ئەگاتە چی؟ خۆشم نەمئەزانی دوایی جەسـتەم بریارەکـانی ئـەدان و روحیشم پەشیمان ئەبۆوە.

سێ کەس بووین دونیامان سەرخۆش ئەکرد بە بۆنی هەناسە و جەستەمان.

سێ کەس بووین نەوەك دوان و ئەو ئەزموونەش بووە تامێك کە پێموابـوو تـا ئەوکاتـەش کـەس ئـەو تامـەی نەدیووە.

ئیدی قەتمەر ئەیگووت هەر ئەوەش بوو وایکرد ئولفەت وەها بمرێت کە کەم کـەس مردنـی وای دیبێـت، دوای لێدان و دوای هەزاران تف و هەزاران لەعنەت هەر بەرەجمکردن کوشتیان و ئاگریشیان بەردایە جەستەی.

ئیدی دەفتەرەکەی قەتمەر پڕبوو لە ئاگر و کوشتن و ماچ و جەستە و سەرمەستی. دەفتەرێك بوو بۆنی خوێن و جەستەی تێدا تێکەڵ بوو. بۆنی زینا و بۆنی شەهوەت و ژەهر و مردن و عەشقی لێئەڕژا. بە تریفەی گوتبوو تریفە من ئەڕۆم، ئەڕۆم و ناگەڕێمەوە،ماڵە باوانم نامدەنە ئەو عاشقە، ئەبێت بڕۆم و سەرم هەڵگرم، ئەو دەفتەرە ئەمانەتی تۆ، من عاقیبەی خۆم لەو خاتوونانەوە باشتر نابینم ، بەلاّم ئەوە روحمە ئەوە جەستەمە پێم ئەڵێ بڕۆ. ئەوە دەفتەرەکە ئەمانەتی تۆ و منیش خۆم داوەتە دەست ئەو عەشقە.

قەتمەر کە سەربوردەی هەموو ژن و کچەکانی لە لا بوو، سەربوردەی خۆیشی لای دەستە خوشکەکانی بوو، ئەو باسیکردبوو کە چەند (یار سمکۆی ) خۆش ئەوێ ، ئەگێڕنەوە کە باسی دەسبازییەکانی خۆی ئەکرد لەگەڵ ئەودا کەس بەرگەی شەهوەتی چاوەکانی نەئەگرت، ئاوەها باسی ئەکرد ئەتگووت لە پێش چاوی ئەواندا خۆی ئەکا بە بن یار سمکۆدا. ئەیگووت لێوەکانی لێو نین کانیلەی شەڕاب و تامی ترێن، کە ئەڕژێتە ناومەوە دونیا بەبەرچاومەوە ئەبێتە رووبارێك لە شەهوەت، من هەمیشە لە دووری ئەوەوە ئەلەرزم ، ئەهەژێم کە ئەشیبینم چۆکم ئەشکێ و تا ماچم نەکات زمانم نابێتەوە، ئەڵێی ئەو کوڕە جوانە نوشتەی لێکردووم، بە سیحرێکی سەیرەوە پەلکێشی ناو خۆیم ئەکات، ئەگەر ماچم نەکات ناتوانم یەك وشەی بۆ بڵێم، یار سمکۆ پیاوە پیاو ، دەستەکانی ئەڵێی هەر بۆ ئەوە دروستکراون کە هەمیشە مەمکەکانی منی لە لەپدا بێت، ئەو کوڕی زەمانێکە کە دونیا بەسەر شەهوەتدا بکەوێت، ئای چ نور و ئیشراقێك لە سینگییەوە هەیە ، چ بۆنی گۆشتێکی تووشی هەیە، کە یەکسەر مەستم ئەکات و هۆشم لە خۆم نامێنێت، جەستەیەکی هەیە پۆلاّییە لە زەوق و کانییە لە میهر، جەستەی بارانی عەشقی لێئەبارێ و پێدەشتی ماچی گەرم گەرمە. من هەموو جەستەییم ماچ کردووە خانەیەك نەماوە ماچم نەکردبێت . ئەویش لە من خراپتر ، کە یەکدی ئەبینین ئەو بەوهەیبەتەی خۆیەوە دەستەکانم ئەخاتە سەر روومەتی و ماچی نەرم نەرمیان ئەکات، بە هێواشی دەست پێئەکات و دواییش وردە وردە روو و گەردەنم ئەکاتە ئاو. بۆنی گۆشتی ئەو ئەڕژێتە ناو مەمکەکانم بەرەو دونیای مەندەهۆشیم ئەبات، تا ئەو ساتەی لەو کادینەدا رەنگ و روومان لە ناو یەکدیدا بزر ئەبێت. بەو دەستانەی هەڵمئەگرێت و لەسەر دۆشەگە شڕەکە درێژم ئەکات وەك مار خۆی لە لەشم ئەئاڵێنێ و توند توند خۆی ئەکا بەسەرما، هەموو جەستەم ئەگوشێ ، هەموو لەشم ئەهەژێنێ، وا ئەزانم لەسەر زەوی نەماوم و لەناو تریفەدا گەوز ئەدەین، پرچم بۆن ئەکات، لەشم بۆن ئەکات و خۆی تێهەڵئەسوێ و رووت رووت هەڵمئەگرێت و لەو ژوورە تەسکەدا پشتم ئەنێ بە دیواردا و بەلەشییەوە بە دیوارەوە هەڵمئەواسێ باسکەکانم ئەکەمە ملی و ئەمکێشێتە ناو خۆی، تەواو رووئەچینە ناو یەکدی، بەهەواوە لەناو تریفەدا وەرئەبم و مەندەهۆشانە تەنیا گوێم لە هەناسەکانی ئەوە، لە ئاهەکانی و لە قسە بێدەنگەکانی. خۆی بە قوربان ئەکەم، روومەتی ئەلێسمەوە و پرچی ئەخەمە دەممەوە، هەر بەهەواوە پێیەکانم توند ئەکەم و لەناو قەدی ئەودا خۆم ئەگوشم، بەلاّم لە گەڵ ئاهەکانی خاو ئەبمەوە و هەڵمئەگرێتەوە و بڵندم ئەکات و منیش توندتر دەست لە ملانێی ئەبم و توندتر پرچی ماچ ئەکەم.

ئەمدا بە ئەرددا و هەر بەماچ ئەمکوژێ و هەناسە بڕکێم ئەکات. منیش زیاتر بە خۆمییەوە ئەنووسێنم و زیاتریش رووئەچمە ناوی، یار سمکۆ یاری ئەرزو ئاسمانم، جەستەی هەتاو و کانیلەی تریفە، ئەرژێمە ناوی وەك چۆن ئەرژێمە ناو ئاوی کانی.
شل شل ئەکەومە هەواو و نەرم نەرم خوێن و دڵ و ناو قەدم بەرز و نزم ئەبێتەوە، دەستەکانم شل شل ئەکەونە سەر سینگمەوە و ئەویش پەنجەکانم ئەکرۆژێ ، ئەیانمژێ و ئەیانخوا.ئەڵێ هەرگیز جوانی وام نەدیوە ئەی دڵبەر و روحبەر تا رۆژی قیامەت، لێوەکانی ئەگەزێتەوە و یەك دونیا ئاه بەسەر چاوو پرچمدا پەرش ئەکات، هەناسەکانی گەرم گەرم ئەکەونە سەر رووم، ماچەکانی تەڕ تەڕ مەمکم ئەسووتێنن، من تەواو جەستەم هی ئەوە و روحم هی ئەوە و ئاو و فرمێسك و تریفە و هەتاوەکانم بۆ ئەون.
تەواو من ئەبێت لەگەڵ ئەودا بڕۆم و بڕۆم و بە غەیبی ئەودا رووبچم،
بەڵام قەتمەر هێشتا نەڕۆیشتبوو کە بەمەرگێکی کپ و بێ دەنگەوە رەوانەی گۆڕستان کرا، مەرگێك لەسەر دەستی باوکەکەی، کە گوایە بە سکی پڕەوە شاردیانەوە، قەتمەر لەو عەشقەدا نامووردانە سەری نایەوە و لەو ساوەش کەس نەیزانی یار سمکۆ چی بەسەر هات.
قەتمەر سەربوردەی کچێکی عاشقی جوانکیلە بوو، سەربوردەی هەزاران کچی بێ ڕێگە و بێ ئازادی و بێ هومێدبوو، قەتمەر کە هەمیشە ئەیگووت من بۆنی خوێن لە هەموو شتێکدا ئەکەم تەنیا لە یار سمکۆدا نەبێت ، من بۆنی مەرگ لە هەموو قوژبنێکدا ئەکەم تەنیا لەگەڵ یار سمکۆدا نەبێت، و ئەشیگووت من بۆنی ژیان لە هیچ کوێیەك ناکەم تەنیا لە باوەشی یار سمکۆدا نەبێت.ئای چەند خۆشە کە ئەشمرم لە باوەشی ئەودا بمرم!
بەڵام ئەو مردوو کەسیش نازانێ تەنیا ئەو نەبێت کە کەینێ بوو بۆ دواجار لە باوەشی یار سمکۆدا ژیانی کردبوو. ئەو لە میهرەبانیدا ئەگەڕا کە زانیشی زەحمەتە خۆی بگاتە میهرەبانی تەنیا دەفتەرە خوێناوییەکەی پێ دەرباز کرا.

## 2
## نامەکان

نامەکانی من و تریفە و هەتاو و دەفتەرەکەی قەتمەر و  نامەی برادەران، بە هەموویانەوە حەیرانێك بوون لە حەیرانەکانی سووتان ، پیاسە و گەڕانی روحەکان بۆ ئازادی و خۆشەویستی و عەشق و ژیان، ئێستا دوای تەمەنێك دوای ئەو نامانە هەست ئەکەم هێشتا تامی من و تامی روح و خەونەکانیان لێدێت.

نامەکان تەڕ تەڕن وەك باران و وەك شەراب، وەك حەوزێکی پڕ لە تریفە روناهییەکی پەمبەیی بەسەر رووخسار و چاوی مندا پەرش ئەکەن.

لەناو ئەو نامانەدا رەنگە زیاتر روح قسە بکات، خەیاڵ تیایدا داگیرساوە، فەنەرەکانی مێشك و جەستە و خوێن و هەناسەکان .. حیوارێك لە نێوان خۆیاندا دروست ئەکەن و جاروبارێش تەنیا شعر ئەتوانێت بەفریای رووداوەکان و دەربڕینەکان بکەوێت،

ئەگەر ئەمشەوە غەیببوون ئاوا مەستی نەکردبام رەنگە هەموو نامەکانم نووسیبانەوە، ئەوانەی لە ژوورە تاریك و شەوانی رەمەزاندا نووسرابوون، ئەوانەی لە شەوانی بێ جگەرەیی و شەراب و خۆشەویستییەوە ببوونە نامە و فڕیبوون، ئەوانەی جارێك لە پرسیارێکەوە شعرێکیان دروست ئەکرد کە مەگەر هەر بەخەیاڵ پەنچە پێیان راگەیشتبا:

ـ چۆنی ؟ چ کار ئەکەیت و رۆژانت چۆن بەسەر ئەبەیت لەم غوربەتەدا؟

+ بڕوا بکەیت یان نەکەیت عەزیزم

لەسەر باڵی پەپوولەکانەوە شەرابێ ئەنۆشم لە فرمێسکی چاوت شیرینتر

فڕینێ ئەفڕم لە باڵەکانت رەنگینتر

تۆ ئەی ئاسمانی ئاسمانەکان و خاکی خاکەکان

ئەی تامی تریفە و روناهی هەتاو

تۆ ئەی غەریبتر لە غوربەت و ئەی فەناتر لە فەنابوون

من لێرەوە بەدەم پیاسەوە تا ئێوارەی مەراق و کرانەوە بەسەر هەبووندا ئەگەڕێم

من بەیانیان بەدەم قاوەیەکەوە تا سنووری مردن تاڵی ئەڕژێنمە روحمەوە

من لێرە تا جەهەنەم هەر بە ماچ خۆم لە ئاگر ئەسووم و لە فرمێسکەکانەوە بەرەو شەهوەت بەرز ئەبمەوە

من گریانم لێرەدا رەنگێکی شەهوانی ئەڕژێنێ

لێرەدا هەمیستە مەستم بە بۆنی زنا و بۆنی مەمکە رووتەکان

چۆنم؟ وەك باڵێکی تەڕی هەتاوەوە بە ئاسمانەوە بەردەبمەوە سەر قەترەیەك خوێنی گەلاً

باخۆسیانە بەرئەبمەوە بەسەر جەستەی خۆمدا

لە دەروازەکانی ئازادییەوە مردن و زنجیر و قەفەکانی هەناسەم گرێئەدەم

لە چییەوە بۆ چی بازئەدەم و روو بەدەم ماچی ئەو خاکە ئەکەوم

لە بەیارێك بەسەر مەمکی ترێیەکدا ئەکەوم

لە جادەیەکدا بە بن رانەکانی جۆگەکەیەوە تەڕ ئەبم

لە پارکێکدا بەسەری دارێکەوە سوێند ئەخۆم کە خیانەتم لە تۆ و گیا نەکردووە

چ خۆشترە سوێند بەسەری دارێکەوە بخۆیت و گیاکانیش بڕوات پێ بکەن؟

من حاڵم لە حاڵی قەبرستانێکی پڕ گوڵ جوانترە
مەستیم لە مەستی مەمکەکانی تۆوە بە بۆنی غوربەت پێکەنیناویترە
من ئەڕۆم و کەسێك نیە دەرگەیەکم لێبکاتەوە
من دێمەوە و کەسێك نیە لە پەنجەرەیەکەوە چاوەڕێم کات
دەنووسم و کەسێك نیە بۆی بخوێنمەوە
هەر دەنووسم و کاغەزەکان بەدەم باوە بەرەڵلا ئەکەم
دەنووسم و زیاتریش بە سەخافەتی ئەم ژیانە و تۆوە ئەنووسێم
بۆ من نووسین زیندانێکە روحم خۆش ئەکات
ماسۆشییانە تام لە قەڵەم ئەکەم لە ناو پەنجەکانمدا
حەزم ئەکرد هەموو قەڵەمەکانی منت بەناو مەمکەکانتدا داهێنابان
حەزم ئەکرد لەسەر کاغەزەکانی مندا نووستبای
حەزم ئەکرد هەموو شتێکم بۆنی تۆی پێوەنووسابا
تۆش وەك ئەم پەنجەرە و رێگایانەت لە سیماتدا هەڵسوببان و لە رۆحی مندا ئۆخەیەکت پێکردبام
من تازە تەواو گیانە لە زیندانی نووسیندا خۆشەویستی ئەکەم و هەر لەو زیندانەشدا ئەمرم
بۆیە من لێرەدا لە نووسینەوە ژیان ئەکەم و بە نووسینەوە خەریکم
نووسینەکانم منیان لە نێو خۆیاندا فەناکردووە، خۆشیان حەزیان لە بایە حەزیان لە بارانە حەزیان لە هەتاوە
ئەفیونیش ئەوەندەی بیرکردنەوە لە تۆ و برادەران و ئەو کچانەی خۆشم ویستوون گێژم ناکات
وشە وشە بە ناو خوێن و روحمدا ئەکەونە بەر پێی گوڵ رێحانەکانی باخچەکەم لێرەدا
من هەمیشە ئەبێت رێحانێك ببینم تا تامی تۆ و شتەکانی دیکەم بە زماندا ئاشنا کاتەوە
سەیرە هۆگۆی من بە رێحانەکان
هەندێجار لەسەر پەلکە رێحانێك رۆمانێك ئەنووسم بڕوا بکەیت یان نا کتێبێك لە رێحانێکەوە تۆمار ئەکەم و هەر هەموو وشە و حەرفەکانم مەست ئەبن بە بۆنی رێحان و دوایی تێك ئەچن و نازانن خۆیان رێکخەنەوە
بەردەوام نووسینەکانی سەر پەلکە رێحانەکان ئەبنە بۆنێکی سەیر و دوایی بە هەواوە پەرش ئەبن
زۆر جار لە خوا پاڕاومەتەوە تەنیا نووسینی پەلکێکم بداتەوە تا ئەمجارە لەسەر پەردەی ژوورەکەم یان لەسەر جامی پەنجەرەکە یان لەسەر لەشی کچێکی بنووسمەوە، بەڵام خوا نامداتەوە و بە پێکەنینەوە ئەڵێ جا من عیلاقەم چی یە؟
ئا لێرەدا خودا زۆر جار لەگەڵم دائەنیشێ و زۆرجاریش لە قاوەخانەیەکەوە بە سوودفە یان بەکاری خۆیەوە یەکدی ئەبینین و تێر تێر قسە ئەکەین، بە زمانێکی تەڕەوە بۆم ئەدوێت ، تەڕتر لە پەلکە رێحانەکان هەندێجار ، قسەکانی وەك شعر وان و بۆگۆرانی گوتن زۆر خۆشن، پێی ئەڵێم ئەی خودا .. ئەی میهرەبان دەبا

لەسەر فنجانی ئەم قاوەیە ئەو شتانە تۆمار بکەین؟ هەر بە پێکەنینەوە ئەڵێ بڕوا بە فنجان مەکە. ئەڵێم دەبا لەسەر ئەو مێزەیە بنووسینەوە، ئەڵێ ڕەنگی شتەکان بە قسەکانی من تێکمەدە، ئیدی قەناعەتم پێئەکا کە نووسینەوەی قسەکانی لەسەر شتەکانەوە ئەزیەتێکە بۆ شتەکان.

ئیدی عەزیزم زۆربەی کاتم لەگەڵ قاوە و ڕێحان و وڕێنەکانمە، بیرم لەوە کردۆتەوە لەسەر یاتاغ و مۆکێت و کاشییەکانی حەمامەکە زۆر شت بنووسم، بەلاّم پێم ناکرێت ، من ئەزانم نووسینەکانی من تەنیا ئەزیەتی من ئەدەن و ئەزییەتی هیچ شتی دیکە نادەن، بەلاّم ئەو ساتانەی کە ئەمەوێ لەسەر ئەو شتانە بنووسم فەنەرەکانی گیان و دەست و پەنچەم ئەکوژێنەوە و تروسکەیەك حەرف و وشەم نادەنێ.

گەمەی نووسین لەگەڵ من گەمەیەکە تا سەر کوشندە، تا بۆنی ڕێحان مەست، من و نووسین دوو باوەکوشتەی یەکدین و بە خوێن قسە لەگەڵ یەك ئەکەین، شەوێکیان دەمارێکی خۆم بڕی بای قەسیدەیەك خوێنم ڕژاند، لەسەر فریزی باخچە کچگەکە کە هەر دوو مەتری چوار گۆشە بوو نووسیم ، نووسینەکەم هەموو ئاهەکانی کچێکی برادەرم بوو کە شەوێکیان لەگەڵم نووست، ئاهەکانی ئەوەندە سەیر بوون کە مەگەر تەنیا لەو شەوەدا بە خوێن بمنووسیبایەوە، ئاهەکانی لە گەرووپەکەوە ئەهاتنە دەر ئەتگووت هەموو سحری ڕۆژهەلاّت و چیاکان و هاژەی ڕووبارەکان و قاسپەی کەو و شنەی باڵی پەپوولەکانی منی تێدا گیربووە، نرکەی ئەهات و بۆنی هەموو شتەکانی منی لێ ئەهات، بۆنی عەشقەکانی من بۆ تۆ و بۆنی لەشی تۆ و هاوارەکانی ڕوحی من و ڕێحانەکانی سەرم، سەیر بوون ئەو ئاهانە کە لەو ڕازان و ڕامووسانەدا لێی ئەڕژان، من هزرم لای هیچی ئەو نەبوو تۆ و خەمەکان و نامەی برادەران و وشەی دەفتەرەکانی قەتمەر و پێکەنینەکانی ئولفەت و فرمێسکەکانی خاتوون و لەرزینەکانی کچەکانم ئەهاتنە پێش چاو، من لەگەڵ هەموو شتێك جووت ببووم تەنیا لەگەڵ ئەو نەبێت، نا تەنیا لەگەڵ ئاهەکانی ئەودا ئەو سەفەرەی گەڕانەوەم ئەکرد بۆ لای تۆ و برادەران و دەستەی شەوانی قەهر و عەزاب و خۆشەویستی .

ئەویش ڕژابووە ناو مێژوومەوە، تا قوڵترین شیرینی و تاڵییەکانی من ڕووچووبوو، وشە وشەی نامەکانی من لە ئاهەکان ئەخوێندنەوە، بۆن و ڕێحان و قەتمەرەکانی منی لە دەمەوە ئەهات، بۆنی تۆی لێئەهات بۆنی برادەران و کچەکانی دی، بۆنی ژنی برادەرەکان و بۆنی منداڵەکانییان ، ببووە من هەستم ئەکرد لە گەڵ خۆمدا جووت ئەبم، ئەڕژامەوە ناو خۆم و لە ئاهەکانیدا ڕوحم ئەهات و ئەچوو، ئەوەندە مەراق بووم کە ئەم ئاهانە بنووسمەوە و هیچیش بە هانامەوە نەئەهات، گووتم با خوێنم بەسەر ئەو فریزەدا وەربێت و ئەو ئاهانە بە پەلکەکانەوە بنووسینێت.

ئەو شەوەیان تا تاریکترین ساتی خۆم لە نووتەکییەوە دەستم لە وشە ئەدا تا دوورترین پنتی دەروشانەوە حەرفەکانم ئەگرتن و ئەکردنە نووسین،

هەر بە خوێن قەسیدەکەم درێژ ئەبۆوە و فریزەکەش سوور سوور و زەرد زەرد و کەسك کەسکتر ئەبوو ، نووسین لەسەر فریز بە خوێنێك کە لە جەستەتەوە ئەڕژێت و تێکەڵی خوناوی پەلکەکان ئەبێت، بۆ من ئەزیەت بوو ،

سەخت بوو چیرۆکەکانی خۆم لەو ئاهانەدا بستێنمەوە و بیاننوسمەوە، من هەمیشە ئەمگووت بۆ کێیان ئەنووسمەوە، بۆ تۆ و برادەران بوو، من بێ هومێد ئەبووم لەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو شتانە ئەبێت بخوێندرێنەوە، منیش وەك قەتمەر ئەمویست چیرۆکەکانی خۆم بنووسمەوە، من تەنیا بۆ ئێوەم ئەنووسی و دواییش کە ئەمزانی ئەو جەستەی من وەك ئەو خوێنەی من هەمووی ئەڕوات و جێگەی هیچیش ناگرێت فریزەکە ڕەنگی خوێنەکەمی باش نەئەگرت، نەیئەگرت و منیش دڵۆپ دڵۆپ خوێنم ئەڕژاند و تووڕە ئەبووم.

تووڕەبوونەکەم شەوێکیان بووە گریانێکی سەیر بەسەر کاغەزەکانمدا فرمێسك لە چاو و لە ڕوحمەوە ئەڕژا و لەسەر کاغەزەکان ئەبوونە حەرف و وشە ، وشەی سەیر و سەمەرە، وەك خەون ئەڕژان ئەبوونە هەندێ دەستەواژە کە من خۆشم لێیان تێنەئەگەیشتم، خۆشم نەمئەزانی ئەشێت ئەو هەموو برینانە لە جەستەو ڕوحی منەوە هەبن، برینی گوڵەکان و برینی تاریکایی و برینی کۆترەکان و برینی زۆر خەلیاقەتی دیکە کە من تا ئەو شەوە وامئەزانی من هیچ پەیوەندیم پێیانەوە نیە کەچی هەر هەموویان لەسەر دڵی مندا ببونە برین.

کە برادەرێکم کاغەزەکانی خوێندنەوە گووتی نزانم تۆ چ ئافەریدەیەکی؟ تۆ لە توخمی چ مادەیەکی غەریبی؟ بەو هەموو برینانەوە چۆن ئەتوانیت بنوویت و بڕۆیت و ببێتەوە؟ چۆن ئەکرێت سەما بکەیت و لەگەڵ سۆزانییەکدا و لەسەر فریزی باخچەیەکدا بنوویت؟ چۆن ئەتوانی قاوە بخۆیتەوە و زەلاتەیەك لەو مەتبەخەوە دروست کەیت؟ چۆن تاقەت ئەکەیت ڕێحانەکان ئاو دەیت و هەموو بەیانییان سەمون بکڕیت؟

گووتم نزانم عەزیزم .. من تەنیا هەست ئەکەم لە دێر زەمانەوە من هەم و پەیوەندیم بە شتەوەکانەوە زۆر توند نیە

من گیرۆدەی ئایەت و شعر و هەوەس نیم

من مەخلوقێکم لە گۆشت و تا ئێستاش تەفسیرێکم نیە بۆ ڕوحی خۆم

من نزانم هەست ئەکەم لە هەندێ ساتدا زۆر مێیانە ژیان ئەکەم و پەنچەکانم وەك منداڵێك ئەکرۆژم ، هەندێجاریش وەك ئەوەی قودرەتی نێرێك لە مندا کۆبێتەوە وا ڕەفتار لەگەڵ دارو بەرددا ئەکەم.

من نزانم کە منداڵ بووم بەهیوا بووم سەفەر بکەم بۆ کوێ و کەی و چۆن لام گرنگ نەبوو، هەر پەنچەرەیەکم ئەدیت حەزم ئەکرد سەری بەسەردا بگرم، حەزم ئەکرد بزانم مێرووستانەکان بەشەو چی ئەکەن، گەلاکان لەشەودا چۆن خۆیان تەڕ ئەکەن، ئیدی خولیاکانی من ئەو شتانە بوون.

لە گەنجییەتیدا زیاتر و زیاتر مەراقم بوو مرۆڤەکان بناسم و لە ناوەوە بزانم چۆن بیرئەکەنەوە، هەرگیز من بەدووی قسەکانەوە نەبووم، بەڵکو من لە پشت قسەکانەوە ئەگەڕام بۆیە بڕوام بە ڕاستگۆیی ئەو کەسانە نەبوو کە قسەیان بۆ ئەکردم، لە کاراکتەرەکانی هەموویانەوە بە گومان بووم و ئەمزانی هەر هەموویان خاوەن دوو ژیان و دوو قسە و دوو هەبوونن، هەبونێك کە بەرچاوی هەموانەوە دیار بوو، هەبوونێکیش کە تەنیا بەبەر چاوی منەوە دیار بوو، من ئەمزانی برادەر هەبوو تا ناو خوێن حەز لە خوشکی من ئەکات و لای منیش

نەیئەوێرا تەماشای کات، برادەرم هەبوو حەزی ئەکرد بەبەر چاوی منەوە پەلاماری خوشکەکەم بدات ، کەچی جورئەتی نەبوو و تێیئەگەیاندم کە خوشکی ئەویشە، من یەك کەس تا ئێستاش دڵم پێی ئەسووتێت و زۆرجاریش رقم لێی ئەبێتەوە، کە چەندی ئەکرد و ئەکۆشا توخنم کەویٚ من نەمئەهێشت، نزانم لەو تەمەنەدا بۆچی خۆم نەدا بە دەستی ئەو کابرایەوە؟ هێشتا من لە سحر و نهێنییەکانی جەستە ئاگەدار نەبووم، ئەویش کە کەسی دەست نەئەکەوت بەتەمابوو لەگەڵ مندا خۆی خاڵی کاتەوە.

زەمەنێك بوو سەیر کە لە نوسینەکانی مندا ئەبوونە رووداو و وشە، ئەو کابرایە شەوێکیان دەستی منی بردە ناو دەرپێیەکەی و گوتی ئە ئاوا بۆم بگرە منیش گرتم و گووتی دەستت بلێند و نزم کەوە، نیشانەیەك نزانم لەکوێی جەستەمەوە هات و پێی گووتم بۆی مەکە دەستم هێنایە دەر و ماچی کردم و گووتی دەوەبکە دەی خۆشە. هەڵستام و خۆیم لیٚ خەلاٚس کرد، چەندین جاری دی هەوڵی دا ، تا رۆژێکیان گووتی من تەجروبەم ئەکردی بزانم قوندەری یان نا؟ بەلاٚم ئەمەشیان تەنیا گێلاتی ئەو بوو کە وایلێکرد وابزانێت من بڕوای پیٚ ئەکەم، ئیدی قوندەربوونیش لەوساوە تا ئێستا بەدەیان جار لە هزر و روانینەکانمدا خۆی کردووە بە بابەت و ئەو کوڕەش تا ئێستا لەو رووداوانەدا جیا نابێتەوە،

ئەو شتانە سەرەتایەك بوون بۆ ئەو برینانەی لە گەڵمدا گەورە ئەبوون و نەمئەزانی لە پاشخانەکانی هزر و خەونەکانمدا ئەبنەوە بە رووداو و بە خوێن و بە وشە و بە نووسین.

هەر لەو ساوە من ئەمویست دیوی دووەمی ئەو کوڕە بنووسمەوە کە حەزی لێیە دەستپەڕی بۆ بکەم و ئەویش لە پێشماڵەوە خۆی وەك برایەك و زیاتریش نیشان ئەدا، ئیدی لەوێوە من خەریکی دونیای ناوەوەی ئەو کوڕەبووم. دونیای حەز و شەهوەت و راستییەکانی و درۆیەکانی، کە ئەمدیت لێی نەئەترسام و ئەویش بە پێکەنینە فێلاٚوییەکانی ئەیویست هەر چۆنێك بێت بمباتە جێیەکی چۆڵ و دەستم بۆ درێژکات.

رۆژێکیان گووتم وەرە من ئەزانم شوینێك هەیە دوورە دەست، تەنیا من و تۆ لەویٚ رووت ئەبینەوە و کەسیش نامانبینیٚ ئەوەندە بۆت ئەگووشم هەتا خوێنت لیٚ ئەرژیٚ ، لە خۆشیاندا بڕوای نەکرد و لەگەڵم کەوت لەو شوێنەدا گووتم ئەتویٚ چیم لێبکەیت، گووتی تۆ حەزت لە چیە ، گووتم تۆ رەپی کە، لەناو شەڵوارەکەیدا رەپی کردبوو، بە پێوە وەستاو دۆخینەکەی کردەوە گووتی بیگرە منیش گرتم و بۆم شێلا چاوەکانی داخستن و گووتی بۆم بمژە، دەی عاقڵ بمژە.. موسەکەم هێنا دەر و بەپەلە پێمدا هێنا و رام کرد، من هیچ خوێن و ئاو و هیچی دیکەم نەدیت و هەلاٚتم، نەمزانی چی لێهات تەنیا هاوارەکانی هاتنە گوێم کە گووتی ئەی قەحپە داك ئەوە چت کرد؟

ئیدی لەوێوە هەستم ئەکرد قودرەتێکی نێرانەی سەیرم هەیە، کە ئەمدی ناتوانیٚ تەماشاشم کات،

چیرۆکی قودرەتی من رەنگە لەوێوە دەستی پێکردبیٚ ، لەگەڵ دەردەسەرییەکانی ئەو کوڕە،

ئێستا رێك حاڵی منیش لێرەدا وەك حاڵی ئەو کوڕە وایە لەو ساتەی کە لێی هەلاٚتم، لەوپەڕی نەشئەوە پڕی برینم کرد، لەوپەڕی زەوقەوە خەڵتانی خوێنم کرد، منیش وام لەو دەمە بیٚ حەیایەدا پڕم لە برینەکانی حەیا،

لەو زەمەنە بێڕەحمەدا پڕم لە میهر و گولآو ، رێك وەك ئەو كوڕە وام .. لەشم هەمووی شەهوەتە و روحم هەمووی برین.
ئیدی نزانم لە نێوان شەڕەكانی لەش و روحمدا، لە نێوان ململانێیەكانی خوێن و هزرمدا من وام بە پێوە لەگەڵ برینەكانم.
ئیدی عەزیزم من لەسەر ئەو كاغەزانەوە ئەژیم، بەلآم دیارە ئێستا ئەو كاغەزانەش وەك شتەكانی دی سەرسامن لە نێوان برینەكانی من و زەوقەكانی من ،
نووسین خۆی بۆتە تەوقێك و زەوقم بۆتە تەوق و برینەكانیش تەوق.
ئیدی ژیانم تەوقە و تەواو.

* * * * * * *

ئیدی من هێشتا مەستم بە تۆ، مەستم بەونامانەی بۆم ئەنووسی ، ئەوسا قودرەتی ئەوەم هەبوو لە شەوێكدا چەندین لاپەڕە بۆ تۆ و بۆ برادەران پڕكەمەوە، هەر بە شعر و بە پەخشان نامەم ئەنووسی و چەندین وێنەی جوانیشم بۆ لێئەكردی،
بیرمە چەند مەراق بووم پێش تۆ و كەسی دی هەندۆ نامەكانم بخوێنێتەوە، ئەو ئەیگووت جا ئەبێت منیش خۆم بكەم بە رەسام؟! ئەمگووت كوڕە تۆ مادام عاشقی ئیدی شاعیری و رەسامی و هونەرمەندی و شانۆكاری و تەواوی هونەر لە روحتدایە.
ئیدی جاری واهەبوو بە دەمژمێر لەبەر نامەكان دائەنیشتم و كاغەزم نەئەما، جگەرەم نەئەما، بەلآم زەوقی نووسین قەت چكی نەئەكرد ، دەیان بابەت لە دایك ئەبوون و ئەمنووسینەوە، هەرگیز من باسی رووداوەكانم نەئەكرد ، هەموو قسەكان لە قولآیەكی تاریكی منەوە ئەهاتن و بۆ تۆ ئەبوونە نووسین.
بیرمە ئەمنووسی ئەمەوێت یەكەم كەس تۆبیت ماچی بكەم و دەست لەمەمكەكانی بدەم، یەكەم كچ بیت لەگەڵیدا پیاسە بە كۆڵآنەكاندا بكەین و لە تاریكیدا باوەشت تێوەرینم، ئەو یەكەم كەس بوونە هومێدی من بوو لەو كاتەدا و خەونێكی خۆش بوو بۆ ئەوەی حەزەكانی جەستەی خۆمی تێدا بشارمەوە، سەیر بوو من بۆ خاتری چاوەكانت كە سوێندم بۆ خواردبوو كچێك چەندی كردی و كۆشا ماچێكم نەدایێ و كچێكی دیكەش كە لە دڵەوە حەزم لێبوو قسەی لەگەڵ بكەم لەگەڵم نەكرد ، من بۆ چاوەكانی زۆر شتم نەكرد و زۆر شتم كرد ، بەلآم ئێستا كە تەمشای شتەكان ئەكەمەوە بە جۆرێكی دیكە خۆیان نیشانی من ئەدەنەوە، شتەكان هەندێجار لە جاران شیرینترن، رەنگە لێرەدا من هەست ئەكەم تەمەنم ئەڕوا و رابردووم بۆ شیرین بكات، ئەگەر نا بۆ ئەبێت تام لە یادگارییە تاڵەكانی ئەوسا وەربگرم، بۆ ئەبێت كەیفم بەو نامانەوە بێت كە هەموویان بە خوێن و فرمێسكەوە ئەنووسران و تەنانەت دڵنیاش نەبووم نامەكان بەدەستی ئەگەن یان ئەگەر بەدەستیشی بگەن ئەیانخوێنیتەوە و ئەگەر خوێندیەوەش لێیان تێئەگات و ئەگەر تێشیان بگا چ هەڵوێستێكیان بەرامبەر

ئەنوێنێت؟ جارێکیان لە پشتی دەفتەرێکەوە بۆم نووسیبوو تەنها وشەیەکیش بێت بۆم بنووسە ، بڵێ نە.. بڵێ ئا .. جوێنێك هەر چ وشەیەك لە لایەن تۆوە بێت دڵم خۆش ئەکات.

ئێستاکە نزانم بە دڵنیاییەوە بۆچی تامی ئەو نامانە خۆشن و چێژم ئەدەنێ؟ ڕەنگە تەنیاییم هۆیەکەی بێت یان بێزاریم یان غەرقبوونم لە نێو بێ نامەیی و نەنووسیندا؟

نووسین و نەنووسین بۆ من هەر دووکیان تەوقن، هەردووکیان بەقەد یەك کوشندەن. جاران بە نامەیەك هەندێجار ئەگەیشتمە ئۆرگازم و پاك ئەبوومەوە، سووك ئەبووم، بە ئارامییەوە سەرم ئەکردە سەر سەرین و خۆشترین خەو ئەنووستم.

ئێستاکە بەهیچ نووسینێك نە دڵم و نە دەماغم ئاو ئەخواتەوە، دڵم وێرانە و لە دەماغیشم بێ ئومێد بووم کە بگاتە حەقیقەتێك ، بێ ئومێدم لە نووسین و مرۆڤەکان و خۆشەویستەکان و برادەران و ژنەکانیان، بێ ئومێدم لەوەی بە جوانی بە تۆ بگەمەوە و هەتاو بە من بگاتەوە و پێکەوە زەماوەندێ بۆ دڵمان بکەین.

من ئێستاکە لەعنەت لە جەستەم ئەکەم کە ناتوانێ بە ئازادانە و بێ هەستی نائومێدی بتوانێ لەگەڵ جەستەیەکی دیکەدا تێکەڵ بێت، ئای گەر ئەزانی ئەو بەرەڵڵاییەی من چەند کوشندەیە، من لە باوەشی هەموو ژنێکی ئێرەدا ئەگرییێم، ئەگرییێم و بە تەغار خەم ئەکەمە دڵی خۆم و ئەوانەوە.سەیرە یەکێك دوای شەوێکی نەکبەتی مێیلەکی بۆ نووسیبووم و گووتبووی تا ئێستاکە پیاوی وەك تۆ کزۆڵە و نەکبەتیم نەدیووە، تۆ لە بنیادەمێك ئەکەیت کە لەشەڕێکی زۆر سەختدا بە دۆڕاوی گەڕابێتەوە، دۆڕاوێك کە ناتوانێ شانازی بە هیچ شتێکەوە بکات، تۆ دڵت کون کونە عەزیزم، تۆ با یەك هەڵێگرتوویت کە خۆشت نازانی لە کوێ فڕەت ئەدات، تۆ لە تۆفانێکەوە ئەچیت هێزت نەمابێ و هیچت پێ هەڵنەگیرێ، تۆ لەو کەسانە ئەچی کە توانای خۆکوشتنیشیان نەمابێ، ئەرێ بەڕاست تۆ بۆ خۆت ناکوژی؟! بۆچی خۆت ناچار ئەکەی بەم دەردەسەرییانەوە بژیت؟ عەزیزم تۆ هەلا هەلایت و ئومێدێك نیە بۆ ژیانەوەت، تۆ لەو پیاوانەیت هیچ لە باخەڵتەوە شین نابێت، ناتوانی بە میهرەبانی بنووسیت، تۆ ژیانێکی نابووتت هەیە نە زمان فریات ئەکەوێ و نە نووسین، تۆ لە گەمەکانی ژنیشدا زۆر بێ دەسهەڵاتیت، ناکرێت تۆ بەو برینانەوە کەس دەعوەت کەیتە قاوەیەك.

ئیدی منیش نامەیەکم بۆ نووسیبووەوە و گووتم دڵەکەم ئەو برینانە هەموویان تۆ لێیان بەرپرسیاریت، تۆ خاوەنی ئەو نابووتییانەی کە ڕووئەکەنە شەڕەکانی من، تۆ نەکبەتی منی لەو ژیانەدا ، بەوە نیە تۆ لەمنەوە دووری و پێت وایە پەیوەندیت بە چارەنووسی منەوە نیە، تۆ بەرپرسی لە موسیبەتەکانی من ، من خۆم ناکوژم خاتوون بەم برینانەوە هێشتانەکە لە تۆ جوانترم، هێشتانەکە میهرەبانترم لەو تلیاکەی ئەیمژیت و گێژت ئەکات، هێشتانەکە بە زەوقترم لەو سەمایەی تۆ لەبەر گۆرانییەکی بێ مانا ئەیکەیت، ئەگەر خۆم بکوژم تۆ ئەمکوژیت، ئەو سیستەمە ئەمکوژێت کە تۆ شانازی پێوە ئەکەیت و تاقەتی لێوەرئەگریت، خۆم ناکوژم خاتوون بەو ئومێدەی لە شەوێکی دیکەدا قاوەیەکی بێ شەکر بخۆینەوە و تێر تێر پڕت کەم لە گریان و قەهر و عەزاب.

ئیدی بۆی نووسیبوومەوە، خەیاڵە پڕو پووچەکانت ناگەنە ئاستی لێکۆڵینەوە لە گرفت و برینەکانت، تۆ ڕۆژهەلاتییەکی وەك هەموویان بریندار و ڕوح گەورە و بێ بەها. تۆ هێشتانەکە نازانی چەند بەدبەختیت و ئیرەییت بە مەمکەکانی منیش دێتەوە، چی بکەم کە بەژنی ژنەکەت وەك هی من جوان نیە؟!
تۆ نازانی لە جەستە و جوانییەکانی بگەیت بۆیە هەمیشە بە غەمبارییەوە ئەمریت.
بۆم نوسییەوە لە قسە قۆڕەکانت تێناگەم نەوەك لەبەر ئەوەی زۆر گەورەن و گرنگن بەڵکو هەست ئەکەم هیچت نیە بیلێیت،
گووتم من تەنیا ئەمەویست باسی موسیبەتەکانی خۆمت بۆ بکەم، من لێرەوە پێت ئەڵێم وەرە با قاوەیەکی دیکەی تاڵ بخۆینەوە و سەربوردەکانت بۆ تەواو کەم، بەلاّم ئەشزانم تۆ تا پشیلەکەت نەنوێ بیرت نایەتەوە باشە قاوەیەك لەگەڵ من بخۆیتەوە وانیە؟!
بۆی نووسیبوومەوە پشیلەکەم لەو مەسەلەیە وەرمەدە، ئەو پەیوەندی بە کێشەکانی تۆوە نیە، گووتم ئەگەر پشیلەکەت برسی بوو و پارەت نەبوو نانی بۆ بکڕی ئەوکاتە ئامادەم قاوەیەك و بڕێ پارەت بدەمێ تا پشیلەکەت تێر کەیت؟!
بێ ئەوەی باوەڕ بکەم بۆی نووسیمەوە ئێستاکە هۆیەکت هەیە بۆ ژیان، ئەگەر هەفتەی دوو جار خۆراکی پشیلەکەم دابین بکەیت ئامادەم ئێوارانی پێنچشەمە قاوەیەکێ تاڵت لەگەڵ بخۆمەوە.

ئیدی عەزیزم ئێستاکە من جگە لە خۆم پشیلەیەکیش لێرە بە خێو ئەکەم و قاوەش زۆرتر ئەکرم.
بەلاّم دیسانەوەش کێشەکانی من هەر بەردەوامن. بەردەوام ئەگەڕێمەوە سەر نامە کۆنەکان، گۆرانییە کۆنەکان و یادگارییە کۆنەکان. لەو غوربەتەدا لەزەتییان لێوەرئەگرم و دەوروبەریشم پەست و بێزار ئەکەم.
ئێوارەیەکیان گووتم وەرە با هەندێ لەو نامانەت بۆ بخوێنمەوە، بێ دڵ فڕێکی لەقاوەکە دا و گووتی باشە.
گووتم حەیاتم من ئەمەوێ بە زمانی تۆ بیانخوێنمەوە ئەگەر نا من هەر نامەی پێنچ شەش جارم خوێندونەتەوە، بەلاّم ئەمویّ ئەم شەو بە زمانێکی دیکە بیانخەمە ناو ڕوحمەوە، بەڵکو بەو زمانەی تۆ قودرەتێکی دیکە بە ڕوحم ببەخشن و دڵم بە وێنەیەکی دی ئاوەدان کەنەوە.
گووتی کێشەی تۆ ئێستاکە ڕوحە یان جەستەیە؟
+ڕەنگە هەردووکیان بێت، یان ڕاستتر لێرەدا ڕەنگە هەست بکەم زیاتر ڕوحە بەلاّم لە ولاّتدا زیاتر جەستە بوو.
- چۆن؟
+ نزانم من تائێستاش هەر هۆگری مەمکەکانی ژنەکەی خۆمم و قەتیش مەمکەکانی تۆ لە هی ئەو جوانترنین. هێشتانەکەش مەراقم ئەو کچەی سۆزم دابوێ یەکەمجار ماچی بکەم هێشتا ئەو حەزەم هەیە و ئەمەوێ ماچی بکەم. من ئەزانم جەستەم بریندار نیە و تاقەتی پیاسەی دوور و درێژم هەیە و ئەتوانم خۆم بدەمە بەر با و بەر جەستەی تۆ و هەزاران کچی دیکە، بەلاّم کێشەکە لە ڕوحدایە، من لێرەدا ئەتوانم تێکەڵی

ژنەکان بم بەئاسانی بەلاّم ئەبینی ئەو هاوارانەی روح چی بەسەر من و تۆ و ژنەکانی دیکە ئەهێنن؟ کەچی من ناتوانم جەستە و روحم لەیەك جیا بکەمەوە، من ژنەکەم بە جەستە لێرە نیە، برادەرەکانم لێرە نین و ئەوکچانەی بۆ رۆژێك و بۆ ساڵێك و تەمەنێك خۆشمویستوون لێرە نین ، بەلاّم هەر هەموویان بەروحیانەوە بەر ئەبنە جەستەم و لێرەدا لەگەڵم ئەژین من ناتوانم لێیان دابڕێم، من ئێوارەی هەفتەی رابردوو کە لەگەڵ تۆ تێکەڵ ئەبووم من خەیاڵم لای ژنەکەم بوو، چاوەکانم داخستبوون لەگەڵ ئەو جەستەم ئەگۆڕییەوە، لەولاّتدا رێك پێچەوانە بوو، من بە جەستە لای ژنەکەم بووم و بەخەیاڵیش لای زۆر کچی دیکە، لەوێ خەیاڵ بۆ کچی دیکەی ئەبردم ، بەلاّم لێرە خەیاڵ ئەمباتەوە لای ژنەکەم، لەوێ جەستەم لەبەر خەیاڵم داد و فیغانی بوو، لێرە پێچەوانەیە، خەیاڵ قودرەتی ئەوەی نیە نەگەڕێتەوە لای ژنەکەم، جیاوازییەکە ئەوەیە من گەمەیەك ئەکەم کە تێیدا لەش و روح و خەیاڵ و فانتازییاکانم بە شێوەیەکی سەیر و غەریب ژیانم پێ ئەکەن. وەك ئەوە نیە من بم دەسەلاّتم بەسەر ئەو شتانەدا بگێڕم. شتەکان لە منەوە، بێ من ئەڕۆن و ناگەڕێنەوە، ئەو شتانەی کە رووئەدەن بە پلانی منەوە روونادەن، رووداوەکان ئەوە نین من نەخشەم بۆ کێشابن. من جەستەم لەبن دەسەلاّتی خۆم دانیە، لەبن دەسەلاّتی خەیاڵێکە کە ناتوانم پلانی بۆ دانێم. ئەو خەیاڵە روحم مەست ئەکات، یان ئەوە روحمە خەیاڵم مەست ئەکات ، نزانم ئەزانم ئەو جەستەیەش زۆر جار غەریبە لە خۆمەوە، غەریبە بەو نمایشانەی لەسەرییەوە ئەکرێن و بێ برین تەواو نابن. من بێ تۆ و لەگەڵ تۆدا غەرقم لە برین. تۆ رەنگە لەوە ناگەیت کە جەستەی من و جەستەی تۆ چەند جیاوازییان لەگەڵ یەك هەیە، رەنگە تۆش وەك من خەیاڵ بتباتە لای کوڕێکی دیکە و بە خەیاڵ لەگەڵ ئەو سێکس بکەیت، بەلاّم رەنگە تۆ خۆت ئەو کەسە هەڵبژێریت و کاری پێ بکەیت، بەلاّم ئەوەی من وانیە عەزیزم. من لەخەیاڵیشدا ئازاد نیم و ناتوانم کەسێك هەڵبژێرم بە جەستە، من روحم تۆ ئەکاتە ژنەکەم یان هەر کچێکی دیکە، ئیدی دیارە ئەوە پەیوەندی بە تۆوە نیە ، پەیوەندی بەجەستەی منەوە نیە پەیوەندی بە روحی منەوە هەیە، کە شەیداییەکانی خۆی لە خەیاڵ و جەستەی مندا نمایش ئەکات.

ئیدی گیانە من لەوێوە دەیان جار تفم لەو خەیالاّنە ئەکرد کە کچی دیکەیان ئەهێنایە بن لەپەکانم و بن تەواوی جەستەم، دەیان جار ئەبوایە چاو بکەمەوە و تەماشای ژنەکەم بکەم تا دڵنیابم کە ئەوە لەگەڵمدا تێکەڵ بووە نەوەك ژنێکی دیکە، بەلاّم لێرەدا ناتوانم لەگەڵ تۆدا چاویش بکەمەوە، روحم کۆرەم ئەکات و هەڵمئەگرێت و لە ژووری نووستنەکەمدا چاوەکانم ئەکاتەوە کە لەوێدا لەگەڵ ژنەکەم لەسەر تەختەکەمان ئەنووین و دەست لە ململانێی یەك ئەبین، مەسەلەی مەراقی دەستگرتنتم کە بەیەکەوە ئەخەوین ئەوەیە من هەمیشە دەستی ژنەکەم ئەگرت تا خەوم لێئەکەوت بۆیە ئێستاش ناتوانم دەستەکانی تۆ نەگرم کە ئەنووم، ئیدی عەزیزم ئەوە تۆ نیت کەبەخاتری پشیلەکەتەوە لەگەڵم ئەنوویت، ئەوە تۆ نیت کە قاوەیەکم لەگەڵ ئەخۆیتەوە و لەگەڵم ئەرازییێت، ئەوە پەنچەکانی ژنەکەمن دێنە ناو پرچم و ئاهەکانی ئەون دێنە ناو روحمەوە، ئەوە تۆ نیت لەسەر گازەری پشتدا بەهەواوە هەڵتئەگرم و ئەتبەمە ئاسمانی ژوورەکەم، بڕوا بکە هەتا ئەو ژوورە

نەکبەتییەش رەنگ و وێنەکانی ئەگۆڕێن و ئەبنەوە بە ژووری نووستنەکەی من و هەمان رەنگە قاوەییەکەی ئەویم ئەدەنە چاوەکانم. ئەوانە لێرە روونادەن ئیدی تێم ئەگەیت، کەیفخۆشیت یان نا بەو قسانەم ئەوەیە روحی من و دەسبازییەکانی جەستەی من لەگەڵ تۆدا، ئەوەیە برینەکانی من و جەستە و روحم، ئەوانەن گەمەکانی دووری و نامۆبوونی من لەو دونیایەدا،

من نابووتترین جەستەی ئافەریدەکان لە روحمدا مەلە ئەکات

وێرانەترین روحی خەیاڵگر جەستەم لە ئامێز ئەکات

من دێوانە نیم لە بیابانی روحدا جەستەیەکی کوژرا و هەڵگرم و بەرەو مەفتەنی ببەمەوە

من نزانم روح لە کوێوە ئەوەندە شارەزایە لە سەمای جەستە

من جەستەم ئەسیری روحێکە تا دەمار دەمار خوێنی ژنێك لە ناویا دێت و ئەچێ

روح روح خوێنێك بە ژندا وەر ئەبێت

تۆ ژن نیت ئەی قاوەخۆر

تۆ خاوەنی پەنچەکانی خۆت نیت لە وێرانە جوانەکەی مندا

تۆ لەو ژورە نیت کە ئێستاکە پێ لەسەر پێ قاوە ئەخۆیتەوە

تۆ .. من ، ژنەکەم و ولاتێك لە فانتازیا لێرەدا رەنگی هەقیقەت و وەهم تێکەڵ بەیەك ئەکەن

نە تۆ تۆیت و نە من منم و نەجەستە و روحیشم ئەتوانن بگەنە ئێمەوە و نە من و تۆش فریایان ئەکەوین.

ئیدی راکشێ ئەی بۆنی تریفە و عەنبەری حەشیشە لەناو لەپەکانی مندا وەك پشیلەیەکی ماڵی

راکشێ بزانە من هەتا دووری ولات لە تۆوە دوورم

راکشێ بزانە تا نامۆترین قەترە ئەرژێمە سەرت

خەونێکە لەگەڵ تۆدا ئەم شەوانە تەنیا قاوەکە هەقیقەتە و ئەوانەی دی گەمەی روحن روح

ئەوانەی دی ساختەی خەیاڵن .. خەیالی جەستەیەك کە هەموو هێزی لەدەستداوە بۆ جوانی

ئیدی عەزیزم من لەگەڵ تۆدا جوان نابمەوە ، من لەگەڵ تۆدا چش لە ماچ و دەستگرتن

ئیدی عەزیزم تێبگە من بۆچی قاوەیەکت ئەدەمێ و پشیلە خرپنەکەت بە خێو ئەکەم؟!

جوانییەکانی تۆ لای من وێران ئەبن و وێرانەکانی منیش لای تۆ جوان ئەبنەوە

ئەوە گەمەیەك نیە بیکەم بۆ ئەوەی لێت ببمەوە، بەلاٚم هەقتە گەر هەست بکەیت تۆ لە من دۆڕاوتریت لەسەر جەستەی خۆت.

ئیدی شەرت لەسەر جەستەت مەکە بگا بەجوانی

شەرت لەسەر روحت مەکە لەگەڵ مندا بفرێت

شەرت لەسەر پەنجەکانت مەکە لەگەڵ مندا ئاشنا بن

تۆ لە هیچی ژنەکەی من و کچێکی ولاتەکەم ناکەیت

تۆ لە هیچ خەیاڵێکیش ناگەیت شەوێك هاتبێتە روحمەوە و جەستەی بریندار کردبم
ئیدی عەزیزم تەنیا و تەنیا ئەو قاوەیە بەخاتری پشیلەکەتەوە تاکە هەقیقەتە لەماڵی مندا.

* * * * * * *

من لە ئاسۆیەکی تاریکەوە دێم و ئەچم
ئەم ئاسۆیەم لەبەر هەتاو جوانترە

من لەوەتەی تەنیام مەراقی تاریکی شتەکانم، مەراقی تاریکییەکانی جەستەی تۆ و جەستەی خۆم، مەراقی تاریکییەکانی ژیانم، تاریکییەکانی نووسین، زۆر شەوان هەموو گڵۆپەکانی خانووەکەم ئەکوژێنمەوە و لە تاریکیدا دەست بە جگەرە کێشان و خواردنەوە ئەکەم، شەوێکیان لەگەڵ ژنێکی رەش رەش لەتاریکیدا تا بەیانی دانیشتین و قسەمان کرد، ئەو هەندێجار ئەیگووت هەق وایە گیتارەکەم هێنابا و بەدەست ئەو قسانەتەوە گۆرانیم گووتبا، قسەکانتم کردبا گۆرانی، منیش پێئەکەنیم و ئەمگووت خواش ئەوە قبوڵ ناکات، ئەویش ئەیگووت جا خوا پەیوەندی بەمەوە چیە؟ ئەو نەیئەزانی خوا پەیوەندی بە هەموو شتەکانی منەوە هەیە، پەیوەندی بە قسەکانم و بە رەفتار و گوفتار و تەنانەت شکل و شەمایلیشم، گووتم خوا وا هەمیشە لەناودڵمدا پیاسە ئەکات و لە گوڵزاری سینەمدا عەشق ئەکات و شعری میهرەبانانە ئەنووسێت، گووتی ئەو شعرەکانی بۆ کێ ئەنووسێت، گووتم شعرە عاشقاوییەکانی بۆ من تا بیانکەمە قسە و بە تۆی قولە رەشیان بفرۆشم، ئەی شیرینتر لە رووناکی؟! گووتی لەوە ئەچێت راست بکەیت؟

گووتم ئەکرێت ئەمشە و گومان لە قسەکانی منەوە نەکەیت؟ گووتی ئەترسم بمرم ئەگەر گومان نەکەم؟ گووتم خۆش نیە هەمیشە بە ترسەوە لەگەڵ کورێك دانیشی و بەترسەوە جگەرە بکێشیت و بەترسەوە بخۆیتەوە و قسان بکەیت، گووتی نا هەرگیز خۆش نیە، گووتم دە گومان مەکە و لە مردن و من مەترسە، گووتی ئاخر تۆ لە مرۆڤێکی رۆژهەلاتیش ناکەی تا بەدوای شتێکدا بگەرێم و لێی نەترسم تۆ سەیریت وەك ئەوە وایت لە دونیایەکەوە هاتبیت کە تەنیا ئاسمان و بەرزایی هەبێت لەوە ئەچێت تۆ لە رووبار و خاك و ئاو و شتی دیکە نەگەیت، من هەست ئەکەم تۆ هەمیشە لە ئاسمانیت.

من هەمیشە لە ئاسمانم و لە ئەرزم و لە ناو باخەکان بە پێخواسی هەڵدێم و وەدووی سەگێك یان کچێك ئەکەوم یان هەر سێکمان وەدووی یەك ئەکەوین،

گووتی بەلاّم قەت هەمیشە بۆنی سەگێك و کچێك لە هەناسەکانتەوە نایەت؟

پێم سەیربوو گووتم من بەلایەنی کەمەوە رۆژانە یادی ماچەکانی ژنەکەم ئەکەمەوە؟چۆن بۆنی ئەوم لێ نایەت؟ بۆنی برادەرێکم لێ نایەت؟

ئیدی تابەیانی هەمیشە بەشێك لە روحمەوە بەوە سەرقاڵبوو کە چۆن ئەو بۆنی ژنەکەم و برادەرانم ناکات.

گووتم باشە بۆنی چیم لێدێ؟ گووتی ڕەنگە ئەوەیان بۆنی بخور بێت یان سابوون یان شامپۆ یـان هـەر بـۆنێکی دیکە بەڵاّم بۆنەکە بەهەرحاڵ سەیر نیە و ئاساییە.

گووتم بۆنی غەریبی لە ڕوح و جەستەی مندا ناکەیت؟ گووتی بۆ من جەستەت زۆر ئاساییە ڕووت و بێ موو و سپی و سارد ، لەوە ئەچێت تۆ زۆر سەری خۆت بشۆیت و ڕۆژانە ڕدێن و سمێڵ بتراشیت؟

گووتم خانم من لەخەمی ئەو شتە سادانەی تۆوە نیم من ئێستا ئەبێت دەیان جار بپرسم تۆ بۆچـی بـۆنی ژنێـك لەمنەوە ناکەیت؟ بۆچی بۆنی برادەرێك لەمنەوە نایەتە ڕوحتەوە؟

گووتی پێت وایە ئەمە پەیوەنـدی بەمنــەوە هــەبێت یـان بــەتۆوە؟ گــووتم نـزانم بــەڵاّم ڕەنگــە پەیوەنـدی بــە هەردووکمانەوە هەبێت وانیە؟

گووتی من پێم وایە تۆ زۆر مەراقی ماسۆشییانە ژیان بکەیت، حەزت لێیە جەستەت ئازار دەم؟

گووتم چۆن ئازارم ئەدەی؟

گووتی ئەتوانم لێوەکانت توند توند بگرم و پەنجەکانم بخەمە ناو کونیلەکانی لەشتەوە؟ گووتم تۆ ئەی ژنــی ڕەش سەیری، تۆ لەوە ڕەشتری کە بێ بۆن و تامت کردم،

گووتی نا من وام لێنەکردووی ڕەنگە تۆ هەر خۆت وابیت و ئاگاداری شتەکان نیت؟

گووتم من کە خودایەك لە دڵمدایە چۆن غافڵ ئەبم؟

گووتی من گومانم هەیە تۆ خواناس بیت، گومانم هەیە کتێبەکانی ئەو بخوێنیتەوە و بیپەرستی؟

گووتم پێت وایە بە ئازاردانم بۆنەکانم بگەڕمەوە؟

گووتی نزانم بەڵاّم ئەگەر حەز ئەکەی با هەوڵدەین ،

لێوە ڕەشەکانی و پەنچە ڕەشەکانی و ددانە سپییەکانی وەك باروقە بەلەش و خانە خانەی جەستەمدا ئەگـەڕان، بە زمانی هەموو لەشی کردمە ئاو و هەمووشی مژییەوە، هەستم ئەکرد ئازارم ئەدات بــەڵاّم خۆشــیش بــوو و دیسانەوەش بەشێك لە جەستەشم هەر بە بۆنی ژن و برادەرانەوە مژوول بوو،

دوای ماوەیەکی زۆر و ئازارێکی زۆر گووتی تۆ خەریکە لەو دونیا و ژیانەدا فەنا ئەبیت بۆ ناگەڕێیتەوە زێـدی خۆت، لەوێ ئەتوانی خۆت لە هەموو بۆن و بەرامەکان وەردەیەوە،

گووتم ناکرێ ئەی ژنی ڕەش ، نەمان ئەو جێ و ڕێ و کەسانە نەمان دیسان لە ئامێزییانەوە بنووم و تێــر بــۆن بکەم. نەمان و منــیش وەك خــۆم نــەمام، ئەوەنیــە بــۆنی ئەوانیشــم پێــوە نــەماوە ، بــۆنی جادەکــان و تــۆزی کۆڵاّنەکانیشم لێ نایەت.

گووتی باشە کە ئەوەندە مەراقی ئەو بۆنانەی بۆ لەدەستت دان؟

گووتم فوبکە بەو بلورەی ڕوحم ڕائەژەنێ ئەی ژنی ڕەش

خوێ بکە بەسەر ئەو هاوارە شیرینانەی لە دەممەوە نایێنە دەر

تۆزێ بکە بەو ڕوومەتەی من تا نەخشی سادەی جارانی من ببینی

ببینە لەو تاریکییە چ فەنابوونێکە عومری من و لەبەرامبەر ئەو دوکەڵە تاریکەوە بخۆوە
بزانە تامی چیم لێدێ
من نە تامی نیشتمان و نەتامی ژنەکەم و نەتامی منداڵێکیشم لێدێت
ئەی ژنی رەش ئەی کەعبەی رەشی تاریکییەکانی ئەمشەوەم
بەو دەست و پلانەتەوە ناتوانی بگەیەنێتەوە بەردەرکەکانی غوبار و بخورەکانی خۆم
ناتوانی بمدەیتەوە دەست بارانێك بمخواتەوە و بمکاتەوە بە خوناو
ئەی ژنی رەش من ئێستا کە تەنیا تفێکم ئەوێ کە لەباوەشتدا بمخەوێنێت و فەنام کە لە خۆم
من سەرخۆش نابم بەهیچ مادام بێ بۆنەکانی رابردووم
من تەنیا هومێدم نەقشی حەرفێك بوو لە جەستەم کە بەر زمانی تۆ بکەوێت
دەی با بڕۆین بەو شەوە قاوەیەك نۆش کەین لە شوێنێك کە هەموو شوێنەکان ماڵی من نین
با بچین پیاسەیەك بەسەر روحی مندا بکەین لە کەنار دەریا
با تف کەینە گەردوون و بگریێن
با روو لە خۆمان کەین و من تێر تف لە تۆ بکەم و بڵێم بروخێ دونیا
تۆش تف لەمن بکە و بڵێ بروخێ تەنیایی
من تف ئەکەم و ئەڵێم نەمێنێ دووری و بزرکردنی نووسین
تۆش تف بکە و بڵێ نەمێنێ دونیای بێ شعر
من تف ئەکەم و ئەڵێم بروخێ جەستەم
تۆش تف بکە و بڵێ بمرێ روحت
ئەڵێم و تف ئەکەم و تف بکە و بڵێ
دەبا وابکەین هەر لە ژوورەکەمدا وابکەین
تفێکم پێداکردوو گووتم بمرێ ژنی رەش لە شەوی سپیدا
گووتی بمرێ پیاوی سپی لە شەوی تاریکدا و تفێکی پێداکردم
تفێکم لێکردەوە و گووتم بمرن ئەوانەی قاوە بۆ پشیلەیەك ئەخۆنەوە و ئەوانەی هیچیان نیە بۆ وتن
تفی کردوو هاواری کرد بمرن ئەوانەی شاعیرن و نانووسن
گووتم با بمرن ئەوانەی ناتوانن نامەیەك بۆ خۆشەویستان بنووسن
تفی کردوو گووتی بروخێن ئەوانەی خۆشەویستی ئەدۆڕێنن
- با بمرن ئەوانەی ناتوانن بۆنی منداڵی بکەن
+ با شێت بن ئەوانەی جوانییەکان لەدەست ئەدەن و بێئومێدانە بۆی ئەگرین
- با بمرن ئەوانەی نازانن جەستە سەرچاوەی ژیانە نەوەك روح

+ با بمریٚ روحێك كه ناتوانیٚ جه‌سته‌ی بریندار چاك كاته‌وه

- بمره كه ئازاد نیت

+ بمره كه ناتوانی تف كه‌یته دونیا به پێكه‌نینه‌وه

- تف كه ناتوانی به‌ڕەللا بیت له زه‌مه‌ن

+ بمره كه به‌نابووتی له‌تاریكیدا ناتوانیت تف بكه‌یت و گۆرانی بلێیێت

- بمره و مه‌ژی بیٚ گوڵه ڕێحان و باخچه‌یه‌كی بچووك

+ بمره بیٚ شه‌ڕاب و بیٚ قسه كردن له‌گه‌ڵ دار وبار

- تف تف تف تف تف تف

+ بمره تف له ئازادی و تف له ژیان

- تف تف تف تف له كۆته‌كانی روح

+ بژی جه‌سته .. بمریٚ برین

- تف تف تف تف تف تف تف تف تف تف

ئیدی تا دره‌نگی دره‌نگان یه‌كدیمان به تف و گریانه‌وه سواخ دا. تا دره‌نگان تا ئه‌و كاته‌ی من قودره‌تم نه‌ما نه‌گرییێم و به‌سه‌ر به‌ژنی ئه‌ودا نه‌ڕشێمه‌وه، ئه‌ویش زۆر به زه‌وقانه‌وه فرمێسكه‌كانی لێستمه‌وه و تا رۆیشتیش هه‌ر ئه‌یگووت تف كه له خۆت و له من و له‌و گه‌ردوونه ، ئه‌گه‌ر ئه‌زانیت به‌و تفانه‌وه ئاسووده‌یت هیچ مه‌كه ته‌نیا بچۆ به‌ر ئاوێنه و به‌ر دار و باره‌كان، یان هه‌ر شتێك كه روو و روحی خۆتی تێدا ئه‌بینیته‌وه، برۆ له‌به‌رامبه‌ری راوه‌سته و هیچ مه‌كه ته‌نیا تفكه.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

خۆ من دوایین شتیش له‌و عه‌به‌سه‌دا خنكاندمی ئه‌و كاغه‌زانه بوون كه ئیدی توڕه‌ییان كردم و تا رۆژێكییان هه‌موویانم سووتاندن، هه‌موویانم كۆكردنه‌وه وهاویشتمه ناو ئاگردانێكی رووسوور، ناتوانم بلێم خۆشحاڵبووم به سووتانیان به‌ڵام ئه‌و كات هیچی باشترم پێنه‌بوو بۆ نامه و شعر و ره‌سمه‌كان جگه له ئاگر نه‌بێت،

له ئێواره‌یه‌كی دیدا كه به‌كچه‌كه‌م گووت ئیدی هه‌موو شته‌كانم سووتاندن و ته‌نانه‌ت كاغه‌زی سپیشم له‌ماڵه‌وه نه‌هێشت،

گووتی ئه‌ی ئه‌گه‌ر ویستت شتێك بنووسیت؟

گووتم نانووسم، یان راستتر ته‌واو من ناتوانم بنووسم

- هه‌ست ناكه‌یت بیٚ نووسین ره‌نگه بمریت؟

+ نا، ره‌نگه بسووتێم، بدۆڕێم، به‌ڵام نامرم

- ئەوانەش وێنەکانی مردن نین؟
+ نەخێر مردن تەنیا وێنەیەکی هەیە.
- سەیرە تۆ وا بێ گومان قسە ئەکەیت؟
+ وەك ئەوەی تۆ بێ گومان قاوە ئەخۆیتەوە؟
- ئا هەر وا بەڵام تۆ پێت خۆشە من بێ گومان قاوە بخۆمەوە؟
+ تۆ پێت ناخۆشە من بێ گومان بم کە نووسین زیندانی منە؟
- ئا پێم ناخۆشە، ئەوەی نێوان من و تۆش ئێستا لەو قاوەیە زیاترە
+ چی زیاترە.

خۆی بێ پێشەکی رووت کردەوە و سووراوێکی لە جانتاکەی هێنایە دەر و گووتی ئەتوانی لەسەر جەستەم بنووسی.

سووراوەکەم لێوەرگرت و گووتم چی بنووسم؟

گووتی هەر شتێك کە بەخەیاڵتدا بێت؟

گووتم هیچم بە خەیاڵدا نایەت

باوەشی تێوەرێنام و ماچی کردم نە یەك و نەدوان و نە سەدان ، کەوتە لێستنەوەی دەم و لێوم و روومەت و گەردەن و هەموو لەشم، ئەیگووت ئەبێت بنووسی وەرە ئەو ماچانەی من لەسەر جەستەی منەوە بنووسەوە ، پێت وایە بۆ وا ماچت ئەکەم ئەی غەریب؟ بۆ وا لەباوەشت ئەگریم و ئەتلاوێنمەوە؟ بۆ وا مەراقم جەستەم بکەیتە کاغەز و شتێکی لەسەر بنووسیت؟ تۆ تەنیایت، تۆ لە جەستەی منەوە دووری ئەگەر هەست بە جەستەی منەوە بکەیت ئەتوانی لەسەری بنووسیت، هەر بەو سووراوە وە بنووسە، من پێت ناڵێم چی بنووسی بەڵام ئەگەر وام لێکردی حەرفێکیش بنووسی بەختەوەر ئەبم، منی خستە حاڵەتێکی سەیرەوە لەو ئێوارەیەدا، سووراوەکەم هەر لەدەست بوو، گووتی برۆ بە خەیاڵی خۆت ئەگەیتە کوێ ئەوێ بنووسەوە باس لە تەمی زێدەتەکەت بکە، باس لە جەستەی ژنەکەت بکە، باس لەو پەڵە هەورە بکە کە بەوێنەی پەپوولەیەکەوە دیبووتە، باس لەو چێژە بکە کە لە خوێندنەوەی نامەی خۆشەویستەکانت وەرت ئەگرت، باسی ئەو خیانەتانە بکە کە لە نێوان جەستە و روحی تۆدا ڕوو ئەدەن باسی ئەو پەیمانانە بکە کە لە نێوان خوێن و خەیاڵتدا تێك ئەشکێنرێن، باس لە بێ قودرەتی خۆت بکە بەرامبەر بە جوانی، باسی باغێك بکە لە دووری، باسی خۆت بکە ئەی روحی من.

باسی چیرۆکە خەمگینەکانی کچەکانی شارەکەت بکە، باسی عەشقە پڕ لە نائومێدییەکانی گوندەکەت بکە، باسی منداڵی خۆت و مەمکەکانی خوشکەکەت بکە. باسی مێلاقە هەنارەکان بکە، باسی یەکەم ماچ و یەکەم چیرۆکی جەستە بگێڕەوە، ئیدی ئەوە هەمووی ژیانە و نەکبەتییە تۆ باسیان بکەیت، باسیان بکە لە باوەشی مندا ئەو شتانە لە کوێن چەند لە رووحتەوە نزیکن ؟ پێم بڵێ من لە کوێی منداڵی تۆدام؟ لە کوێی

ژووری نووستنەکەتم؟ لە کوێی باخەکەم و دارێکم بۆ بچێنە با لە بن ئەو دارەدا تێر سێکس بکەین. خەونەکانی من لە ناو جەستەی تۆدا ئەبنە خوێن و ماچەکانم ئەبنە هەور و بەسەرتدا ئەبارن. تۆ ئەی روح بەسە ئەوەندە جەستەت مەکوژە بە بۆنی منداڵی و بۆنی ژن، ئەوەندە دڵڕەق مەبە بەرامبەر بە پەنجەکانی خۆت و لێوەکانی خۆت، دەستی گرتم و سووراوەکەشی خستە ناو دەمی و تەڕ تەڕی کردو لەسەر مەمکەکانی خۆی دانا، لە نێوان مەمکەکانی پەنچەو سووراوەکەی ئەبرد و ئەیهێنا، سووراوەکە لەسەر جەستەی هەندێ هێڵی نارێك و نارۆشنی دروست کردن، چاوەکانی داختبوون و لەسەر لەشم بڵند و نەوی ئەبوو، قسەی نەما و تەواو رووچۆبووە ناو جەستەی خۆیەوە، بە پەنچەکانیشی سووراوەکە و پەنجەکانی منی لەسەر سینگ و مەمکەکانی ئەجولاندنەوە، تەماشای هێڵەکانی سەر سینگیم ئەکرد و جەستەم پڕ ئەبوو لە حەزی سێکس و نووسین، سێکسەکەم بۆ ئەکرا بەڵام نووسینەکە نەئەکرا، هەندێ پنتی بێ سەرو بەرم رەسم کردن کە زانی پەنچەکانم ئەجولێنەوە دەستی بەردام و ئاهێکی گەرمی بەسەر رووداا رشتم و هاواری خۆش خۆشی ئەکرد، ئاه و ئۆفەکانی خەریك بوو گورویتینێکی باشترم بدەنێ ، ئەو تەواو خۆی لە جەستەی مندا ختم کردبوو و بەڵام من نەمئەتوانی خۆم لە نووسیندا ختم بکەم، هەر پنت بوون ئەمکردن و نەئەبوونە حەرف و وشە، سینگ و مەمك و زگ و گەردەن و روومەتەکانیم هەمووی کردنە پنت و هێل بێ ئەوەی بتوانم حەرفێك نەخش کەم، دوایی هەر لە گەردەنییەوە و بە نێوان مەمکەکانیدا و بەر سینگ و زگیدا هێلێکی راستم کێشا تا گەیاندمە ئەو پنتەی لەشی من و ئەوی تێدا تێکەڵ ببوو و لەوێوەش بۆ سەر زگ و سینگ و تا گەردەنی خۆم.

ئیدی زانیم لەو ساتەشدا وشە لە دایك نابێت.

کەوتمە لێستنەوەی هەموو پنت و هێلەکانی سەر جەستەی دواییش لە حەژمەتاندا سوراوەکەم خوارد.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

چیرۆکی عەشقەکانی جەستە مەستی ئەکرد و ئەیگووت سەیرە لەو ولاتەی ئێوەدا بەو هەموو ترس و لەرزەوە لەش ئەگۆڕنەوە؟ رەنگە جوانییەکانی مەرگ و شەهوەت ، ترس و حەز کە تێکەڵ ئەبن بنیادەمێکی سەیر دروست بکەن، بنیادەمێك کە لە ناو هەردوکیاندا غەرق بێت؟!

گووتم نازانم من بۆخۆم جارێکیان لە حاڵەتێکی نامۆ بە خۆشەویستەکەم شتێکم نووسیوە کە ئەڵێ:

من هەمیشە لە ساتەکاندا ویستوومە بژیم

هەمیشە چێژێك هەبێت بە ژیانەوە بمبەستێتەوە

هەمیشە وەك بوونەوەرێکی بەختەوەر لەبەردەم قەهرەکاندا خەندە بگرم

لە دواساتەکانی بێئومێدیدا بە گوڵێك یان تامی هەنجیرێکەوە پێبکەنم

وەك ئەو رێبوارەی لەناو بەفردا وردە وردە ئەمرد .. بیری لەتامی بەفر و دۆشاو و بەفرو مرەبا ئەکردەوە

وەك ئەو موسافیرەی لە دوا وێستگەی هەلاتنی لە ولاّتدا ئەخنكاو بیری لەو بارانە ئەكردەوە كە لە پیاسەیەكدا لەو و دەسگیرانەكەی ئەدا

دە فێرمكە لە شەڕدا لە گەلّ پەرچەمەكانت ئاشت ببمەوە
دە ڕێمبدە لەگەلّ برژانگەكانت بكەومەوە نیگار كردن
من ئەمەویّ لەگەلّ درۆكانیشتدا بەجوانی تەئەمول بكەم و
لەبەر گومان و تۆراندا فێرە میهرەبانی بم

ئەمەویّ لەدوا ساتەكانی خیانەتدا
بە هێمنی جگەرەیەك بكێشم، ئازادانە لە جوانیت رامێنم
بە شێوەیەكی دی بیر لە تۆ و خۆم و عەشق بكەمەوە
بە شێوەیەكی دی بیر لە ژیان و مردن لەگەلّ تۆدا بكەمەوە

دەفێرم كە چۆن بە حورمەتەوە پێشوازی لە برینەكانم بكەم و لە ناو خوێنیشمدا جوانییەك ببینمەوە، فێرمكە چۆن لەبەر رەشەبادا چێژ لە وێرانكردنی دونیا وەرگرم، فێرمكە لەوساتانەی مردن هێرشم بۆ دێنیّ من بۆ كائینێك بۆ خەلیاقەتێك بكەمە كەنی؟
من نزانم لە تووە فێر بم یان لە ئازار یان لە چێژی خۆمەوە بۆ ژیان؟
تۆ چاوەڕێی چی لە پیاوێك ئەكەیت كە ناتوانێت نە دەستبەرداری خۆشەویستیت بێت و نە ئەتوانێت بیّ تۆ تام لە دونیا بكات؟ تۆ چیم لێئەكەیت كە ناتوانم خۆشمنەوییێت و تا تامی گولاّلە لەبەر با عاشقت نەبم؟
چیم لێئەكەیت تا تام لەو هەموو قەهرانەوە وەرنەگرم؟ چۆن لەو ترسەدا بە خەندەیەكەوە نەخنكێم؟
ئەترسم گیانە تا تاریكایی شەو لە قەبردا ، بیّ چێژ بمرم
بیّ تام .. بیّ زەوقی شاعیرانەم وەنەوز بدەم و تروسكەیەك نەبێت لە چاوە گەشەكانت بمهێنێتە خەندە بەرامبەر بە فەنابوون. من ئێستا تەنیا مەراقی ئەوەم بە خەندەیەكەوە لەباوەشتدا بمرم.
بە ماچێكەوە سەر بنێمەوە.
من بۆیەشە هەمیشە مەراقی ئەوەم لە حالّەتی رووچوونە ناوتدا بمرم لە گەرمترین ساتی تێكئالاّن و تێكەلّبوونمان بەیەكدا تەواو بم.
سەیرە بەلاّم هەمیشە هیوادارم لە جووتبووندا لەگەلّ تۆدا بمرم، ئەوساتە هەمووم چێژە بۆ مەحف بوون لەناو لەزەتی باوەش و سۆز و ئاه و دەنگ و هەناسەی تۆدا، من ئەزانم خۆشە لە بەیارێكی پڕ تریّ و پەلكە مێودا بمرم، لە روخ دەریاییەكی شین شیندا بمرم، لە فڕین بە ئاسماندا بمرم، لەبەر باراندا بمرم، ئەو مردنانە هەمووی

خۆشن، بەڵام مردن لە ساتی تێکەڵاوبوونی روح و جەستە و سۆز و هیوا و ئومێد و خەیاڵ و فانتازییاکانم بەناو تۆدا ئەبێتە بەیار و دەریا و فڕین و جوانترین چێژی هەبوون،

گووتم ئەزانی شەوێکیان ئەوەندەی سەرخۆشێك حەزم ئەکرد باوکی کچێك بکوژێت؟ حەزم ئەکرد لە گەرمترین ساتی سەرمەستی و سەرسامیم بە جەستەی کچەکەیەوە بێت و خەلاسم کات؟ بە ئەنقەست لە ماڵەکەیاندا خۆم ئاشکرا کرد، ویستم باوکی بێت و لە ساتی چێژدارترین خۆشیدا بمکوژێت. ئەمەیان هەوەسێك بوو لە ناو روحمدا بە جەستە و بە کچ و بەمەرگ شێتی ئەکردم، رەنگە تۆ پێت وابێت من جودام لە مرۆڤەکان ، من شێت بم رەنگە راستیش بکەیت، بەڵام من لەبەرامبەر جەستەدا هەمیشە سەرسام بووم و سەرسامم، ئەمەویست ئەو سەرسامییە تێکەڵ بە مەرگ بێت ئەو چیرۆکە لەو جوانییەدا کۆتایی بێت، من کە لە گەشاوەترین نەشئەی جەستەم دابووم، دایکی هاتە ژوورەوە ئێمەی بەرووتی دیت، حەزم ئەکرد بیکاتە هەراو مێردەکەی بێت و تەواوم کات، بەڵام نەیکرد کچە لە بن جەستەم هاتە دەر و هەر بەگریانەوە خۆی فڕێدایە بەر پێی دایکی، ئەویش بێ دەنگ کەوتە رنینەوەی روومەتەکانی و گریانێکی سەیر، کە دەنگی نەئەهاتە دەر و رووبارێك لە چاوەکانییەوە ئەهاتنە خوار، من یەکسەر زانیم نایەوێت بکوژرێم، نایەوێت لەوساتە شەهوانییەدا بمرم، بۆ ئەو ساتێك بوو لە حەیاچوون و لە کوشتن، بۆ ئەو کوشتنی من شتێك نەبوو لە سەرنانەوە لەسەرسامی جەستە، بۆ ئەو ئەو مەراقە هیچ تێگەیشتنێکی نەبوو، نەیئەزانی من چی لە جەستەمدایە و چیم ئەوێ، هەموو هەوڵێدا رەوشەکە نەتەقێنێتەوە، لەو ژوورەدا هەرسێکمان ئەوەندەی دونیا دڵپڕبووین، بەڵام من لە خەمی جەستە بووم بەشێوەیەك کە ئەوان مەحاڵ بوو لێم تێبگەن، بۆ ئەوانیش من ئەمزانی کە ترسێکە لە مردن و لە حەیاچوون و کارەسات نانەوە، ئیدی شەوێك بوو سەیر لە جەستەی مندا و لە تێگەیشتنم لە مردن و چێژ و روح و گەمەکردن بە چارەنووسەکان.

هەر چۆنێك بێت من نە ئەو ژنەم دیتەوە و نە ئەو کچە و نە ئەو بەزمە بەڵام هەمیشە ئەو هەستە لە جەستەمدایە کە مردم من بە هومێدی ئەو چێژەوە جەستە و روحم لەیەك جیابمنەوە،

عەبەسە عەبەس نیە عەزیزم ئیدی ئەوە جەستەی منە و وا لە خوێن و روحم ئەکات.

ئیدی رەنگە کێشەی من لە نووسین و نە نووسیندا جەستەم بێت نەوەك شتێکی دی، رەنگە ئەو حەزە خنکاوەبێت نووسینەکانم ئەخنکێنێ، رەنگە ئەو شەڕانیەتە بێت لە جەستەدا کە تەماهی ئەکات لە درەوشاوەترین ساتەکانی خۆیدا بۆ دواجار کپ بکەوێت و هەڵنەستێتەوە.

من رەنگە ئێستاکە لە وەحشێکی بریندار بکەم بەرامبەر بەو یادگارییانە کە هەمیشە ئەمەوێت لەبەرامبەر مردندا لە قوڵترین پنتی ژیانەوە راوەستم، لە کاتی دەرچوونی روحدا جەستە سەروەر بێت و ئاگای لە روح دەرچوونیش نەبێت،

مرۆڤ هەمیشە کە جەستەی بەرامبەرە بە لەناوچوون ئەو ساتانە زیاتر ئەتوانی هەست بەوە بکەیت کە خۆشە بە جەستەتەوە بژیت و هەموو هەستەکانت کار پێ بکەیت، هەمیشە هەموو شتێك ببینیت و دەست لێبدەیت و تام بکەیت و بۆن بکەیت و گوهدار بیت،

من لەوشەوەدا هەستم بەهەر هەموو شتەکان کرد و هەمووشتەکانی ژوورەکەم دیتن و حەزم ئەکرد لەو دەمە کورتەدا کە هەموو هەستەکانم کاری خۆیان بکەن، کە دایکەکە هاتە ژوورەوە من رووت بووم، تەنها لە ژوورێك بووین و منیش ئاه و دەنگی ماچەکانم بەرز بوون بۆ ئەوەی بگەنە گوێچکەی باوك کە لە ژوورێکی دیدا لە گەڵ ژنەکە نووستبوون، دایکە بە ئاگا هات و کە هاتە ژوورەوە گڵۆپەکەی پێکرد و من چەند چرکەیەك ئاورِم نەدایەوە و حەزم ئەکرد یەکسەر خەنجەرێك بێت و لە پشتمەوە گیر بێت زیاتر پاڵم پێوە بنێت بۆ ئەوەی رووبچمە ناو لەشی کچەکە، بەلاّم نەمتوانی ئاورِنەدەمەوە، یەکسەر چاوەکانی دایکم هاتنە پێش چاو و یەکسەر فوارەی فرمێسکەکانم دیتن و بە پەنچەکانی کەوتە رنینەوەی روومەتەکانی بە نوزەیەکی کەمەوە دەستەکانی راوەشاندن من بزەیەك لێوەکانی گرتم و هەستم کرد ئەو هیچ شتێك لەسەر روخساری منەوە نابینیت، کچەکە خۆی فرِێدایە بەر پێی و گووتی دایە دەنگ مەکە، دایك بە دەست گووتی جلەکانتان لەبەر بکەنەوە، گڵۆپەکەی کوژاندەوە، من لەو ساتەدا حەزم ئەکرد رووناکی ببینم چونکە هێشتا هەستم ئەکرد رەنگە ئەمە دوا ساتەکانی ژیانم بن، حەزم کرد چاوم پرِکەم لە روناکایی گڵۆپێکی زەرد، لەپەنچەرەکە کە کەمێك روناکایی ئەهاتە ژوور ویستم چاوم پرِ کەم لەو رووناکییەو هەروەها لە تاریکی و لە وێنەی مانگیش لە پەنچەرەکە کە پەردەکانی دادرابوونەوە تەماشای دەرەوەم کرد و حەزم کرد بۆ دوا سات بزانم وێنەی دەرەوە لەو پەنچەرەیەدا چۆن دیار ئەکات، چووم پەردەکەم لادایەوەو کچەکە هەر لەو نیمچە تاریکییەدا جلەکانی فرِێدامە بەر پێم، حەزم کرد دەست لە پەنچەرە و ئاسن و دیوارەکە بدەم و هەست بە هەبوونی جام بکەم لەسەر پەنچەکانم، رەنگە من تا ئەوساتە ئاوا هەستم بە روناکی گڵۆپ و جوانی پەنچەرە و تاریکی و تەماشاکردنی دەرەوە نەکردبێت، ئیدی تێکەڵبوونی شەهوەت و مردن و حەزەکان بەیەکەوە ساتێکی زۆر خەلاقە ئەتوانێت لەگەڵ ئەو شتانە ئاشنات کاتەوە کە رۆژانە تۆ لێیان تورەیت و هەستیان پێ ناکەیت، رەنگە ئەو ترس و حەزە وات لێبکات لە دوا ساتدا حەزی ژیان خەندەیەکت بداتێ بەرامبەر بە رووناکایی گڵۆپێك یان مانگ یان هەر شتێك کە لەو ساتەدا دەستی لێئەدەیت گوڵێك بۆن بکەیت، کچێك ماچ بکەیت.

گووتم ئێستاکە لەو شەوەدا ئەگەر بوومەلەرزەیەك یان رەشەبایەك یان هەر کارەساتێك بێت، تۆ چی ئەکەیت یەکەم کاردانەوەی جەستەییت چی ئەبێت؟

گووتی خۆم ئەکەم بە باوەشتدا.

گووتم پێت وایە بۆ وائەکەی؟

گووتی رەنگە لە ترسان بێت.

ڕەنگە وابێت بۆ تۆ بەلاّم لەو ساتەدا کەلەباوەشت ئەگرم، بۆ ئەوەنیە تۆ لــە کارەســاتەکە بپــارێزم بــەڵکو بــۆ ئەوەیە لەو ساتەدا من لە باوەشی تۆدا بە چێژی جەستەی خۆم و خۆتەوە بمرم، بــەو چــێژەوە بــا ببــات و بــاران لێمدات و زەوی قووتم دات.

گووتی ئای کە شەهوانیت؟

گوتم نا مەسەلە تەنیا شەهوەت نیە بەقەد ئەوەی وەك گووتم وەستانەوەیە بەرامبەر بەمردن بە خەندەوە، ژیانە بەجەستە بەرامبەر بە ترس، چیرۆکی عەشقەکانی ئێمەش وان ئێمە هەمیشە لە کارەســاتداین، هەمیشــە لــە بەرامبەر مردنداین و ماچەکانیشمان سەرسامی جەستەمانە بەرامبەر بە ژیان، ڕەنگە ئێمە ئەو مرۆڤانــە بــین کە لەبەر باراندا ، لەناو ڕەشماڵەکانی هەلاّتندا ، بە گریانیشەوە بتوانین سێکس بکەین.

تۆ خەیاڵکە ئەگەر کەوتیە ناو کێڵگەیەکی مینەوە و ترســایت لەهــەر هەنگاوێکــدا مینێــك لــە بــن پێتــدا بتەقێتەوە، چی بکەیت باشە؟

تەماشای هەموو دەورو بەرت بکە و هەست بە هەتاو بکە لەسەر جەستەت، ئەگەر من بکەومە ئــەو حاڵەتــە خۆم رووت و قووت ئەکەمەوە، برکە گیایەك گوڵێك هەر شتێك کە لە پەنجەکەمەوە نزیك بێت هەڵیئــەگرم و تێر تێر بۆنی ئەکەم و دواییش ئەیخۆم، ئەبێت لەو ساتەدا تەواوی هەستەکانم پرکەم لە جوانییەکانی سروشت و ڕەنگە ئەو کاتە من بە سروشت سەرسام بم، کەچی ئێستا سروشت لەوپەڕی لاوازیدایە بەرامبەر بە من، من بۆ ئێستا بیر لەوە ناکەمەوە برکە گیایەك بخۆم؟ بۆ بیر لەوە ناکەمەوە لە ناو سروشتدا بــە رووتــی دەمێــك لەبــەر هەتاو ڕاوەستم و چێژ وەرگرم؟

ئیدی ڕەنگە چیرۆکی عەشقەکانی ئێمەش ئاوابن هەستەکانی لای ئێمە بە هێز کردبێ، چونکە ڕەنگە هەمیشە هەست بکەین ئەوە دوایەمین ماچە کە ئەیکەین و ئەمە دوا هەناسەدان و هەناسە گۆڕینەوەیە.

گووتی ئۆی چەند خۆشە؟

گووتم ئاسانە بڵێیت چەند خۆشە چونکە تۆ باوکێکی دڵڕەق و برایەکی شێتت نیە.

هەڵسا دەرگەی خستە سەر پشت و پەردەکانی کردنەوە و گڵۆپەکانی داگیرساندن و گوڵــەکانی ســەر مێزەکــەی هێنانە دەرو لەسەر جەستەی رووتی مندا پەرشی کردن ئاوی گوڵدانە شووشەکەی بە سەر مەمکەکانی وەرکرد و کەوتە لێستنەوەی جەستەم و لەگەڵ ماچ و مژین و بــۆنکردن و لێســتنەوەدا پــەڕی گوڵــەکانی ئــەخواردن و ئەیخستنە دەمی منیشەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

خۆشە برایەکی شێتت هەبێ

پێی بڵێیت لە سەر ماچێك شەقم لێمەدە

خۆشە کورێك هەبێت بە بەرچاوی باوکمەوە ماچم بکات
خۆشە من لەگەڵ تۆدا لە باخچەیەك تێکەڵت بم
لەسەر کورسییەکی باخچەیەکی کوردستانا خۆم باوێمە ئامێزت و هەموو گەنجەکان تەماشام کەن
حەزم لێیە لەگەڵ تۆدا رووبەرووی مەرگ بوەستم
بۆیە ئەو ساتەی هەستم کرد کە مردن لەدەرگەی جەستەم ئەدات
من گوێی پێنادەم
ریکۆردەرەکە پێئەکەم و گوێ لە مۆسیقا ئەگرم
گوڵێك بۆن ئەکەم و دەست لە هەتاو ئەدەم
لە مردن ناپرسم کە لە جەستەم ئەچێتە دەر تکایە دەرگەکان بگرە
چونکە من هەمو دەرگەکان بە کراوەیی بە جێدێڵم
هەموو پەردەکان ئەکەمەوە
لەسەر فریز درێژئەبم و خەیاڵی تۆ ئەکەم

ئەمە ئیمیلی ئەو کچە بوو ، کە لە دوا ئێوارەدا نووسیبووی.

دوای ئەو ئیمیلە ، شەوەکەی خەریکی چەت بووین و لە بەشێکیدا ئەم دیالۆگەی لێکەوتەوە:
hoshang72: ها قاوە خۆر خەریکی چیت؟
fanny: تەسەورەکانت دایم راستن
hoshang72: واش نیە هەندێ تەسەوراتم فریان بە راستییەوەنیە یان رەنگیشە راستییەکان فریان بە تەسەوری منەوە نەبێت
hoshang72: گرنگ زۆر کەیف خۆشبووم کە شعرەکەتم دیت بەوە راگەیشتم لێرەوە سەردانت بکەم
hoshang72: چونکە ئێمە بەچی رائەگەین؟ هەر زەمەن بە ئێمە رائەگا و دوایی ئەمانرزێنێ و بێڕەحمانە ئەمانکوژێ.
fanny: تۆش زەمەن زۆر ئەکوژیت تا ئەو تۆ ئەکوژێت ، خۆت بەمەغدور مەزانە بەرامبەر بەزەمەن.
hoshang72: زەمەن بێرەحمە و ئێمەش هیچمان پێناکرێت لەو رۆژانە بوومە 35 ساڵ
fanny: وانیە ئێمە رەحم بە زەمەن ناکەین
hoshang72: کچێ دوایی ئەرزین مشك و مار ئەمانخۆن و ئەو جەستە جوانانە ئەبنە خۆراکی دەعباکانی بن عەردی.
fanny: سی و پێنج ساڵ هێشتا منداڵی.

hoshang72: من كە بیر لەوە ئەكەمەوە ئەو مەمكانەی ئێستا توندو تۆڵن و مـن لـەزەتیيان لێوەرئـەگرم ڕۆژێك كرم ئەیانخوا

fanny: پێش ئەوەی ئێمەش بچینە بن عەردی دەعبای زۆر ئەخۆین و رەحم بە هیچ ناكەین.

hoshang72: ئەوەیە گرفتەكە من هەست ئەكەم بە 350 ساڵیش هەر منداڵم هـەر كـەی بمـرم هـەر بـە منداڵی ئەمرم ئەوەیە گرفتەكە.

fanny: ئەوە گرفت نیە ئەوە خۆشییە.

hoshang72: فایدەی چیە كە دوایی ئەخورێنیەوە و فەنا ئەبین و لەناو ئەچین.

hoshang72: ئەوە قەهرە ئەوە عەزابە ئەوە ژیان نیە ئەوە تەنها راكردنە لەو مەرگەی لـە زگـی داكمانـەوە هێناومانەتە سەر زەوی

fanny: نا من پێموانیە بەتەواوی لەناو ئەچین، راكردنە لەترسی مەرگ بەرەو مەرگ.

hoshang72: وەها لەناو ئەچین نەبێتەوە ، دڵمان بە چی خۆشـكەین بـەو قسـە قۆڕانـەی لـەدوامان جـێ ئەمێنن.

fanny: بۆیە ئەتوانین بڵێین راكردنە بەرەو مەرگ لە ترسی مەرگ.

hoshang72: ژیان هەمووی هەڵاتنە لەمەرگێكەوە بۆ مەرگێكی دیكە.

fanny:نا ئەگەر بیر لە دوای خۆمان نەكەینەوە؟ بەوەی بتوانین بۆ ئەو كاتانە بژین كە لەزەتیان لێوەرئەگرین.

hoshang72: ئێمە خۆمان نین، مەحكومین بە مەرگ ، جا دوای خۆمان چ قسەیەكی قۆڕە؟

fanny: رەنگە بە پێچەوانەش بێت راكردن بێت لە ژیان بۆ ژیانێكی تر.

fanny: ئەی كەواتە بۆ مەرگی خەڵكانی تر جوان ئەكەیت؟

hoshang72: هەموو ژیان لە پێناو ئەوەیە مرۆڤەكان ئەیانەوێت بە جوانی بمرن.

fanny: بۆ دەست هەڵناگریت لە بەرەو بەمەرگ بردنی كەسەكان ، ئەزانی هەندێكجار وا هەست ئەكەم كـە باسكردنی جوانی و خۆشی و لەزەتی مەرگ وەك ئەوە وایە كە كەسانێك بكوژیت.

hoshang72: شاعیرەكان ئەیانەوێ شاعیریانە ، شـەرکەرەكان قارەمانانـە ، قەحپـەكان سـۆزاوییانە بمـرن. ئەوانە ئەو وێنە جوانانەن كە مرۆڤ بە دوایاندا عەوداڵە بەڵام ئەفسووس.

fanny: ئەفسوسی ناوێت..

hoshang72: ئەوە من نیم بەرەو مەرگیان ئەبەم ئەوان خۆیان مردوون.

fanny: واز لە خەڵكی بێنە ، بەدوای خۆتدا بگەڕێ.

hoshang72: من كێم؟

fanny: تۆ وا ئەكەیت كە خەڵكانی تر بەرەو مەرگ ببەیت بە جوانكردنی مەرگی ئەوان.

fanny: ئەوانیش رەنگە هەر بۆ ئەوە خۆیان بكوژن كە لە دوای خۆیان باسیان بكرێت.

hoshang72: مەحکومین بەمەرگ .. ئەوەی ئەیکەین ژیان نیە نا.. تەنیا راکردنە لە مەرگ ئەبێت لەوە بگەین.
hoshang72: کێ ئەڵێ مەرگی ئەوان جوانە؟ من وام نەگووتوە ، مەرگ خۆی شتێکە لە ئەوکمان و لە هەناسەمان بە هیچیش جوان نابێت نە بەشعر و نەبەنووسین و نەبە شتی دی.
fanny: تۆ هەر شتێك ئەڵێی گرینگ نیە بۆ خوێنەر، بۆ خوێنەر ئەوە گرینگە کە چۆن تێئەگات.
hoshang72: خوێنەر کێیە .. ئەو خۆی مەحکومە بە مەرگێك .. کە قەت جوان نابێت.
fanny: من هەست ناکەم کە مەحکوم بم بە مەرگ.
hoshang72: کێشە ئەوەیە ئێمە هەموومان مردووین و عەبەسیانە بە سێکس و منداڵ و ماڵ و خواردنەوە و ململانیێ و شەڕ و ئاژاوە و مرۆڤایەتی و نزانم چی تر لەهەوڵی ئەوەداین درەنگتر بمرین.
fanny: هەر لەبەرئەوەی کە بیری لێناکەمەوە و هەست ناکەم کە بە مەرگی من شتێك کەم ئەبێت یان زیاد.
hoshang72: تۆ مەحکوم نیت بەڵکە مردویت و تەواو.
fanny: نەك لەبەر ئەوەی کە بڵێم من نامرم.
hoshang72: ئەوەیە کێشە چونکە مردووین بۆیە شتەکان لەچی زیاد بن؟ لە ژیانێك کە تەنها راکردنە لە مەرگ؟
fanny: رەنگە مردبم بەلاّم خۆم هەستی پێناکەم کە خۆشم هەستم پێی نەکرد ئەوە ئەو مردنە هیچ کاریگەرییەکی نیە
hoshang72: ما مەرگی کێ شت لەو ژیانە زیاد و کەم ئەکات؟
hoshang72: کاریگەری لەچی؟
hoshang72: کاریگەریی چیە؟ کێ ئەیکات و بۆچی ئەیکات و چی ئەگۆڕێ؟
fanny: من بە ژیان راناگەم خەونەکانم زۆر لەوە بلاّوترن کە بتوانم کۆیان بکەمەوە.
hoshang72: جا مەرگ مەودای کێ ئەدا بە ژیان رابگات کە هەموومان بەمنداڵی بمرین.
fanny: زور جار ولاّمی ئەم پرسیارانە بە خۆ فریودان ئەزانم بەدوای ولاّم داگەڕانیش غەفلەتییە.
hoshang72: خۆ ئەگەر ئەوەندەی کیسەڵێك ژیابایین رەنگە ئەو کاتە هەندێك لە خەونەکانمان زا بان.
hoshang72: جا ژیان چیە جگە لەوغەفلەتی و خۆفریودانە؟ بزانم ژیان چیە؟
fanny: نا من پێم وایە زاینی خەونەکان زورە بەلاّم لە ناو هەر خەونێك هەزاران خەونی تر هەن.
hoshang72: یەعنی ئەگەر ئەو پرسیارانە نەکەیت و نەگەڕێی و فریو نەخۆیت و هتد.. یەعنی ژیانت بردەوە؟ ئاخر هۆگربوونی مرۆڤ بە خەونەکان ئەوەیە ئەو ترسەیە لە مەرگ کە ئەیەوێ بە قەد عومری پشیلەیەك هەموو دونیا تەی بکات؟
fanny: بکەی یان نەکەی بگەڕێیت یان نا بە شێتی یان بە عاقلی بە زانین یان نەزانین تو ئەژیت.

hoshang72: دواییش ئەتۆپیت و تەواو.. کرم کرم کرمەکان ئەمانخۆن؟
fanny: چی تەواو ؟؟؟
hoshang72: راکردن لە مەرگ.
fanny: کێ ئەڵێ کرم من ئەخوات ، رەنگە ئاگر بمخوات  یان نا رەنگە ماسی.
hoshang72: تەسلیم بە مردن ئەبیت و تاقەتی راکردن و خۆشاردنەوەت نامێنێت
hoshang72: هەمووی یەك شتە بەسەری تۆ.
fanny: من خۆی لێناشارمەوە.
fanny: نەوەك لەبەر ئەوەی کە ئازام.
hoshang72: پێت ناکرێ خۆت بشارییەوە شاردنەوە تەنیا هەوڵێکی عەبەسی بێ بایەخە.
fanny: چونکە بیری لێناکەمەوە.
hoshang72: عیلاقەی بە ئازایەتی و ترسنۆکییەوەنیە ، گیانەکەم.
hoshang72: بیرکردنەوە لە مەرگ بێ ئەوەی پێی بزانی لەناو هەموو هەناسەیەکتدا حازرە.
fanny: ترسنۆکەکان لەتەمەنی خۆیان بچووکترن.
hoshang72: بۆ سێکس ئەکەی. بۆ ئەخۆی ؟ بۆ سەفەر ئەکەیت و ئەنووسیت؟ هەرچی ئەیکەیت تەنیا ئەوەیە تۆزێك بە جوانی و حورمەتەوە بمریت.
fanny: گرینگ نیە بزانم بۆ ئەیکەم ، گرینگ ئەوەیە کە ئەیکەم.
hoshang72: کە ئەوەشیان هیچ لە وەزعەکان زیاد و کەم ناکات و تەڕ و وشکی ناکات.
fanny: کە نەشیکەم گرینگ نیە بزانم بۆ نایکەم.
hoshang72: گرینگ ئەوەیە کە ئەیکەی .. جا تۆ باشە ئەیکەی و نزانی کە لەمردنەکان رائەکەی قوڕ بەسەر ئەو کەسەی کە شتەکان ناکات و ئەویش هەر لە مردن رائەکات.
fanny: نا بو وا بلێین بو نەلێین بە بەردەوام تەڕ و وشکی ئەکات.
hoshang72: چونکە هەمووی یەکە
hoshang72: هیچ ناگۆڕێ
hoshang72: هیچ هیچ هیچ
fanny: چ قوری بەسەر بێت و چ زێڕ هەر یەك شتە.
fanny: بەبیرت دێت لە شعرێك باسم لەوە کردبوو.
fanny: کە سووتان لە تاریکی و لە روناکی پاشماوەکەی هەر مشکیە.
hoshang72: موشکیلەکە لەوەیە یەکێك کە سەفا و نهێنییەکانی ناکاتەوە وەك تۆ .. ئەو ئەترسێ لەو خەیاڵەی لەو دیووی مردنەوە دونیای ئاخیرەت و بەهەشت لە دەست بدات.

fanny: ئەوە گرفتە راستەکەیە.

fanny: ئەوەی کە بیر لە مردن ئەکاتەوە ئەوە ئەو کەسەیە کە گومانی لە زیندووبوونەوەی خۆی هەیە.

hoshang72: من ئەمرم و ئەزانم حۆرییەك نیە لە باوەشم بگریّ، ئەمرم و ئەزانم خوایەك نیە بمباتە بەهەشت یان جەهەنەم، ئەمرم و ئەزانم ئەمرم و کراسێکی دی ناکەمە بەر.

fanny: هێشتا نازانیت کە ئەویش هەر وەك ماددەکانی تر لە بارێك و دۆخێکی ترەوە بۆ بارێك و دۆخێکی تر ئەگۆڕێت.

fanny: تۆ کە باوەڕت بە بوونی حۆری بوو ئیتر مردن داگیرت ئەکات.

fanny: جا پێت وابێت کە ئەم حوریە لە باوەشت ئەگریّ یان نا؟

hoshang72: لە بارێکی تورەهات بۆ بارێکی تورەهاتر یەعنی چی ئەگەر بوومە میزی حوشترێك .. دڵم خۆش بێت؟ یان ئەگەر بوومە گورگێك ، پەپوولەیەیەك بە من چی..؟

fanny: واز لە حوری بێنە بزانە کە تۆ وەك هەموو شتەکانیتریت چی ئەکەیت ئەوەت بۆ ئەگەڕێتەوە.

hoshang72: با هی ئێمەش سەفەری پەپوولەیەك بێت بۆ باخچەی گوڵ هەنار و کنێرەکان و شیلانەکان زیاتر نیە.

fanny: راستە ئەزانم هەر تو وانیت هەموومان واین جیاوازیەکی رێژەییە

fanny: خەتای تۆ نیە خەتای منیش نیە.

fanny: خەتای کەس نیە.

fanny: هەر خۆی وایە.

hoshang72: جیاوازییەکانیش هەموویان تەواو ئەبن.

fanny: هەر واش ئەبێت.

hoshang72: کە وایە پێم بڵێ ئەیدۆست چی بکەین؟

fanny: نا من پێم وانیە جیاوازییەکان قەت تەواو بن.

fanny: ئەوە ئەگەر بزانین تەواو بوون چیە؟

fanny: یان تێگەیشتنمان بۆ تەواوبوون هەبێت ؟

hoshang72: جیاوازییەکان تەنیا شێوەی راکردنە لەمەرگ وەك ئەوە وایە تۆ لە باخێك رائەکیت و من لە دەریا تۆ لە شار و من لە دێ ، تۆ لە رۆژئاوا من لە رۆژهەڵات.

fanny: ئەو جیاوازییە کەم نیە، ئەوە خۆی لە خۆیدا گەرانە و بوونێکی ترە ..

hoshang72: بەلاّم سەرئەنجام کە ناچیتە بەهەشت  کە ناچیتە جەهەنەم و کە ناچیتە هیچ شوێنێك چی؟

fanny: ئێمە هەر رۆژەی بوونێکمان هەیە...

hoshang72: ئاخر ئەو بوونە بێمانایانە لە پێناو چی؟

fanny: بو ئەوەندە کە بچیت بۆ شوینێکی دی؟

hoshang72: نزانم؟ خۆشم تێناگەم حەزم ئەکرد بەهەشت و جەهەنم هەبوونایە..

fanny: دوای کە  خوت نامینیت و ئەبیت بە شتیتر

hoshang72: خۆزگە دڵنیابام

fanny: ئەو حەزە کوشندەیە.

fanny: منیش هەندێجار لە ئەنجامی گفتوگۆم ئەو قسەیە ئەکەم

fanny: بەلاّم لەگەڵ خۆم وەلای ئەنیّم

hoshang72: یەعنی وەلای بنێن

fanny: ئەزانی من ئەوەندەی بیر لەو ساتە ئەکەمەوە کە لە ناویدام ئەوەندە بیر لە پاش سعاتێکی تر ناکەمەوە؟

hoshang72: ئەگەر وەلامان نا، چی بکەین هەر لەو شتانە بەردەوام بین کە رۆژانە پێیان راهاتووین؟

hoshang72: ئێ ئێستا ئەوە من بیر لەوشتانە ئەکەمەوە ئەو سعاتەم بە سعاتی دوای ئەوە بەندە ، من هەست ئەکەم لەو سعاتە موهەددەم

fanny: ئەوە خۆتی خۆت

fanny: کێشەی خۆتە

fanny: خۆت ئەتەوێت خۆت ئازار بدەیت

hoshang72: خۆم کێم.. چ کەرێکم، بنیادەمێکم، گوڵێك و جەلادێکم؟

fanny: هەر کەسەو خۆی بە جۆرێك ئازار ئەدات

fanny: بیرکردنەوەش ئازاردانی خودە

hoshang72: یەعنی مەحکومین بە ئازار؟

fanny: هەر چیەك بیت گرینگ نیە ، گرینگ ئەوەیە کە هەیت

fanny: ئازار لەزەتە

hoshang72: هەبوونێکی مەحکوم تا هەناسە هەناسە

fanny: من نازانم تو مەبەستت لەو مەحکومییە چیە؟

hoshang72: یەعنی رێگەی ترمان نیە ئەزیزم .. قودرەتی هەڵبژاردنمان نیە

fanny: هەر وشەیەك دەیان تێگەیشتنی هەیە ، بزانە جیاوازییەکان چەند زۆرن

fanny: هیچ وانیە

hoshang72: تێگەیشتنی من ئەوەیە ناتوانین دەست لە خۆمان بدەین و دەست لەو هەبوونە وەردەین و ئازار نەچێژین

fanny: هەموو شتێك لەبەر دەستی خۆمان دایە

hoshang72: بە ئازارەوە قوربان

fanny: هەموو شتەکانیش خۆمان هەڵیان ئەبژێرین

hoshang72: بۆچی خۆمان ئازار ئەدەین با لەوە بگەم؟

fanny:چونکە لەزەت لەو ئازارە هەیە

hoshang72: بۆچی لەزەتی لێوەرئەگرین؟

hoshang72: نهێنی لەزەت چیە؟

fanny: ئازار جۆرەها لەزەتی هەیە کە لەش و دەروونی کەس پێویستییەتی

fanny: نهێنی لەزەت ئەوەیە کە خۆت نەدەیتە دەست قەدەر

hoshang72: بۆچی پێویستییەتی؟ ئەو پێویستییە کێ پێی بەخشیوە .. سرووشت ، خـوا ، دایـك ، ئـادەم یان حەوا؟

fanny: کە بتوانی خوت ئازاد بکەیت

fanny: هیچیان

fanny: خۆت ئەم پێویستییانە بەرهەم دێنیت

fanny: هەموو شتەکان بە خۆتەوە بەندن

hoshang72: تۆ بە قەدەرەوە هاتوویتە سەر دونیا بە چی خـۆتی بەدەسـتەوە نـادەی؟ یـەعنی ئـەتوێ تـێم بگەینی ئەو سەفەر و ئەو نووسین و ئەو هەراوهۆریایەی ئەیکەین ئەوە نەخشی ئێمەیە و هی قەدەر نیە؟

fanny: بەڵێ

hoshang72: چۆن؟

fanny: من بەقەدەر نەهاتووم

hoshang72: ئەی بەچی هاتووی عەزیزم

fanny: من لە ویستی پیاو و ژنێکەوە هاتووم

hoshang72: ئەی ئەوان بۆچی تۆیان دروست کرد؟

fanny: ویست ویست ویست

fanny: دیسان قەدەر

fanny: ئەو شانە خۆبەدەستەوە دانن

hoshang72: ویست چ گەمەیەکە گیان .. کێ دروستی ئەکات.. کێ بەرهەمی دێنێ نەکا بڕوابکەی ئێمە؟

fanny: من گووتم و ئەیڵێمەوە تۆ هەموو شتێکی

hoshang72: ئێ ئاخر من چیم؟

fanny: بوون ، ژیان، خوشی، مردن ، ئازار، نووسین، خواردن، نووستن و گەڕان ....

hoshang72: ئەوشتانە هەر هەموویان مردنن .. یان ئەو راکردنە بێهودەیە بۆ ئەوەی بــە جــوانی بمریــت و تەواو ، ژیان هەمووی ئەو جوان کردنەیە ئەو خۆرازاندنەوەیە بۆ مردن و هیچیتر نیە.

fanny: تۆ بۆ خۆت شتێکی و بۆ من شتێکی تریت و بۆ تریفە شتێکیتر و بۆ ئەوانی دی شتێکی تر.

hoshang72: ئێوەش بۆ من هەمووتان جوانییەکانی منن بۆ مردن و خۆرازاندنەوەکانی مــنن لەبەرامبــەر تاناتۆس تا ئەو رۆژەی دێت و هەڵمئەگرێ، ئەبێت وابکەم بەو ئومێدەی کە لە ناو ئێوەدا بە جــوانی وەهمێکــی نیگا و نووسین و پێکەنین و قسەکانم ببیننەوە

fanny: مردن بو خۆت شتێکە و بو ئەوانیتر کە پێشتر هەندێکیانم باسکردن شتێکی ترە.

hoshang72: بەلاّم ئێوەش ئەمرن و شتەکانی ئێوەش وەك ژیانی من بێ بەها ئەبێت و تەواو.

fanny: ئەوە لەلای تۆ ، تۆ ئەتوانی بڕیار لەسەر خۆت بدەیت و بەس

fanny: من مردنم بۆ تۆ شتێکە و بۆ خۆم شتێکیتر ....

hoshang72: ئێ خۆ مـنیش هەر ئەوەم کردووە بەلاّم لە دەرئەنجامدا جیاوازی مـن و تریفــە وئــەوانی دیکــە چیە؟ تەنیا ئەوەندەیە کامەمان تۆزێك جوانتر باوەش ئەکەین بە تاناتۆسدا؟

fanny: هەموو کەسەکانیش وان

hoshang72: ئەو شت و شتەکانیتر باوەڕکە تەنیا هەوڵێکی بێهودەی بێتاقەتانەیە بۆ شاردنەوەی ئەوەی کە ئێمە نامانەوێت بمرین و ناشتوانین کە نەمرین

fanny: ئەو جیاوازیەی تو بە کەم ئەیبینیت لەلای کەسانیتر رەنگە زۆر بێت

hoshang72: با من بە زۆریش ببینم بەلاّم چی لە وەزعەکان ئەگۆڕێت؟

fanny: ئەگەر تۆ ئەتەوێت بەردەوام بۆ مردن بژیت وایە.

fanny: بەلاّم من نامەوێت مردن بە ژیان ببەستمەوە.

hoshang72: من هیچم ناوێت خۆم هەڵمنەبژاردووە کە مەحکوم بم بە عومری پیرە کەرێك؟

fanny: دید و بووچوونەکانت ئەگۆڕێت.

fanny: تۆ مەحکومیت بۆخۆت هەڵبژاردووە.

fanny: تۆ خۆت ئەتهەوێت مەحکوم بیت و لەزەت لەو مەحکوم بوونەت ئەبینیت

hoshang72: یەعنی من لە ئەسلدا ئەسیر نیم بەڵکو خۆم دیلییەتی خۆم هەڵبژاردووە؟

fanny: ئەوە بۆ هەموو کەسانێکی تر راست نیە

fanny: بەڵێ

hoshang72: باشە بۆ وام هەڵبژاردووە هۆکارەکان چین تەنیا لەزەت دیتن بەس نیە؟

fanny: تۆ و زۆرمان خۆمان ئەوێت دیل بین بۆ ئەوەی خەبات لە پێناو ئازادی بکەین.

hoshang72: ئێ ئاخر بۆ خەبات لە پێناو ئازادی بکەین هەر بۆ ئەوەی چێژ وەربگرین؟
fanny: هۆکارەکان جیاوازن و زۆرن، بەلاّم هەموویان خۆیان لە لەزەت ئەبیننەوە.
hoshang72: باشە با بپرسم لەزەت چیە؟
fanny:واتە لەزەت خۆی جۆراوجۆرە ..
hoshang72: جۆرەکانی چین و مەبەست لە لەزەت چیە؟
fanny: لەزەت پێداویستی جەستە و دەروونە ..
hoshang72: چیە غەریزەیە؟
fanny: زۆر شتی جیاواز هەن کە ئەبنە لەزەتی جەستە یان دەروون هەر یەکێك لەوانە جۆرێکە ..
fanny: نا غەریزە نیە.
hoshang72: ئەگەر غەریزەیە واتە بەخۆمان هەڵمان نەبژاردووە؟ ئەگەریش غەریزە نیە ئایا هۆکارەکان چین وامان لێئەکەن هەندێ شت بکەین ؟
fanny:بەڵکو پێداویستی غەریزەکانیشە
hoshang72: ئێ بۆ؟
fanny: لەبەر ئەوەی کە ئەوە سروشتی گیانەوەرانە بە گشتی و مرۆڤ بە تایبەتی و بە جیاواز لە گیانەوەران
hoshang72: ئێمە کە گان ئەکەین بۆ ئەوە ئەیکەین تا لەزەت وەرگرین لەگەڵ خواردن و خواردنەوەش هەر وا کەواتە سەرچاوەی لەزەتەکان غەریزەیە
fanny: ئەوە پێکهاتەی مرۆڤە
fanny:غەریزە بریتیە لە پێکهاتەی هەموو گیانەوەران
hoshang72: پێکهاتەی مرۆڤ و غەریزە و دین و بیرو باوەڕ جیاکانن کە هەموویان یان زۆربەیان لەماڵ و لە مەکتەب و لەجێی دی فێریان ئەبین محوەری لەزەتەکان جەستەیە جەستەش مەحکومە بە فەنابوون ..
fanny:واتە هەموو گیانەوەران لە غەریزە هاوبەشن
fanny: بەلاّم مرۆڤ جیا لە گیانەوەران حەزی هەیە.
hoshang72: جیاوازی مرۆڤ لە گیانەوەرەکانی دی ئەگەر عەقڵ بێت ئەوە عەقڵ هەموو شت نیە تەنانەت زۆر لە جەستەش بچووکترە.
fanny: جەستە فەنا نابێت چونکە مادەیە.
fanny: لە بارێك بۆ بارێکی تر ئەگۆڕێت.
fanny: نا عەقڵ زۆر شتە.
hoshang72: جەستە بەو جوانی و نەرمی وتەڕی و خۆشییەوە نامێنێت و دواییش کە گۆڕا ئەبێتە شتێکی دی نابێتەوە من.

fanny: بەلاّم بە رووکەش وا دیار نیە.

fanny: تۆ گرینگ نیت.

hoshang72: عەقلّ تەنیا و تەنیا ڕێگەکانی ڕاکردنت لە مــردن بــۆ ڕوونــاك ئەکاتــەوە کــە دوایــیش لــە نوتەکی هێزی تاناتۆسدا فەنا ئەبێت ...

fanny: مادە گرینگە.

fanny: مادە بوونەکەیە

hoshang72: ئەی کێ گرینگە قوربان؟

fanny: تۆ و من و هەر کەسێك بەشێکین لە مادە.

fanny: گرینگییەکان ڕێژەیین

hoshang72: کەواتە من ماددەم ئەی چی لەو ئازار و نهێنییانە و ڕاکردنانە بکەم؟

fanny: تۆ بۆخۆت گرینگیت هەیە و بۆ من گرینگیەکی تر ووووووووووووووووووووو ووووووووووو

hoshang72: گرنگییەکەم لە چیە کا ئەوەشمان پێبلّێ

fanny: بە ئارەزووی خۆت هەر چییەکت ئەوێت وایان لێبکە

fanny: گرینگییەکەت بۆ خۆت خۆت ئەیزانی

fanny: بۆ من لەزەتێکی و بۆ کەسانی دیکەش لەزەتێکی دیکە

hoshang72: ئارەزووی من چیە؟ ئارەزووی مادەیەکی تورەهات کە ناتوانێــت بــۆ ماوەیــەکی مــەعقولیش جوان بێت؟ من ئارەزووی عومری کیسەڵێك ئەکەم، بەلاّم کە قەدەر ئەو عومرەم ناداتێ چی بکەم؟

fanny: ئەوە تۆیت قەدەر بۆ خۆت هەڵئەبژێریت خۆتیت ئەتــەوێت مــەحکوم بیــت بــەلاّم ناتوێــت ئــیعتراف بکەیت.

fanny: ئەتەوێت فێلّ لە خۆت و کەسەکان بکەیت ئەوەش لەزەتە بۆ خۆت و کەسانیتر.

hoshang72: ئەو لەزەتە چیە بۆ تۆ گرینگە ؟ ئەتەوێت من و ئەوانەی دی لــەزەت بــین بــۆ چــی ؟ ئەگــەر هەست بەوە نەکەی کە تەمەنێکی کورتت هەیە و ئەبێت تا نەمردوویت لەزەت وەربگریت؟

hoshang72: ئێ باشە بۆچی فێلّ ئەکەم؟ لە پێناو چی .. بــۆ بــێ ئــەو فێلاّنــە نــاتوانم ببمــە مادەیــەکی مەعقول؟

fanny: پشیلەکەم پێویستی پێمە بۆیە کۆتایی بەو لەزەتە دێنم ....

hoshang72: شتەکان کۆتاییان هاتووە بەلاّم ئێمە ئاگامان لێ نیە؟

fanny: هههههههههههههههههههههه

hoshang72: بزانە تەمەنی لەزەتەکان چەند کورتە؟ تەنیا چەند ساتێکن و بەس دواییش هەموویان لــەناو ئەچن و تامیشیان وەك هەر شتێکی و دی و قەهرێکی دی ئازارمان ئەدەنێ

fanny: وایە بەلاّم دواجار لەزەتن
fanny: لە لەزەتێکەوە بۆ لەزەتێکی تر
hoshang72: راکردن لە مەرگێکەوە بۆ مەرگێکی دی ئەوەیە سەفەری ئێمە ئەی هاورێ ، رەنگە ئەوەیان دلّنەواییەك بێت تۆزێك باری جەستە و بیر و هۆشم سووك بکات
fanny: ئەوە هەلّبژاردنی خۆمانە ، ئەوە پێداویستییە
hoshang72: پێبکەنە پێبکەنە وەك ئەو ژنە رەشەی بەدەم تفکردنەوە پێئەکەنی.. هاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاها هاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاها
hoshang72:هاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاهاIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIIهاهاهاهاهاهاهاهاهههههه
fanny: سوك بکات یان گران جیاوازییەکە تەنها جیاوازی لەزەتە.
hoshang72: بە پشیلەکەشت بلێ با پێبکەنێت و تف لەو گەردوونە بکات.
fanny: ههههههههه
hoshang72: هههههههههههههههههههههههه
fanny: هههههههههههههههههههههههههههههه

❊ ❊❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

مەستبوون بە جەستە و مەستبوون بە خواردنەوە و مەستبوون بە وشە، ئەوانە هەمیشە بە نامەکانی من و برادەرانەوە دیاربوون، هەمیشە عەشقێك موعجیزەی مەستبوونەکانی پێکەوە کۆئەکردنەوە، هەمیشە عەشق ئێمەشی پێکەوە کۆئەکردەوە، ئەو شەوانەی من و هەندۆ دائەنیشتین و هەر بەدەم جگەرەکێشانەوە و قسەکردنەوە شانۆکانمان ئەنووسین، ئەمانووسی و باسی دەزگیرانەکانمان ئەکرد، باسی برادەران و گۆرانی و مۆزیك و نواندن و شانۆ و پیاسە و نامەکان و کتێبەکان، هەمیشە بە مەستی باسەکانمان ئەکردن و تابەیانی مەستانە قسە لە دلّمان ئەهاتە دەر،
لە رۆژانی دووریدا ئەو قسانە بوونە نامەی زۆر و نامەی رەنگاورەنگ، تا ئەهات شێتانەتر باسی عەشقمان ئەکرد و مەستانەتر تەماشای دونیامان ئەکرد، مەست مەست بە کتێبەکانەوە من بە رۆمانەکانەوە چوومە خوار و تا ئەو ساتەش جەستەم لە پاکیزەیی خۆیدا مەستی مەستبوونێکی شێتانە بوو، شێت بۆ مەمکێك، شێت بۆ چێژێك، شێت بە عەشقێکی مەست.
ئێمە عەشقیشمان مەست کردبوو لە گەلّ خولّیا و خەیالّ و ئەندێشەکانی خۆماندا، دونیامان مەست کردبوو بەو بۆنی عەشقەی لە نامەکانی ئێمەوە ئەفڕین.

من ئەبوایە لە شەوێکی ئەو نامە نووسینانەدا بۆ دواجار بمرم و هەڵنەستمەوە تا جارێکی دی قەڵەم نەگرمـەوە دەستم، ئەبوایە هەروەك ئێستا دڵپڕبوومایە و هەمیشە وەك ئەو شـەوە تـامم لـە رەنگـی زەردی گڵۆپەکانـەوە کردبا و هەمیشە لەبەر پەنجەرەیەکەوە بەسەرسامی تەماشای دەرەوەم کردبا.

ئێستاش ئەو نامانە لە یادەوەریمدا وەك ئەو شتانە وان کە لە پشت پەنجەرەیەکەوە بۆ دواجار ئەیانبینم.

من لە گەڵ یەکەم نامەی دڵداری کە باسی خۆشەویستی خۆم بوو بۆ هەتاو پەنام بردە بەر حـەیرانێك کـە لـە روحمەوە هاتە دەر و خۆی خستە سەر کاغەزەکانم. حەیرانێك بوو کە تائێستاش دەستم ناکەوێتەوە، بەڵام ئەوەندە ئەزانم گووتبووم ( ئێستا دونیا لە مابەینی هەولێر و شەقلاوەی لە من دووبەرە، یـار چـاوی رەشـە و دووبـرۆی لەسەرە ) دوای ئەوە ( لە کوێوە بۆ کوێ) یەك خۆی کرد بە روحمەوە ، ئەبوایە من باسی چیم کردبـا؟ چـیرۆکە خەمگینەکانی ژیانێکی تا سەر سەکساری و بێئومێدی و خوێنرژان و هەموو ناخۆشییەکانی دونیا، یان باسی گوڵ و هەتا و و بارانەکانی ئەو هەستانەم کردبا کە لەو هەتاوەوە بەسەر روحـی منـدا لـە دووریـیـەوە پـەرش ئەبوون؟

من لەوساتانەشدا کە پێویست بوو ناسکترین نامەی ئەو دونیایە بنووسمەوە و سۆزدارترین عەشق بنوسمـەوە بـۆ هەتاو، دڵم پڕبوو لە خەفەت و قەهر، روحم تژی بوو لە پەڕاگەندەیی، جەستەم تا ئەوپەڕەکەی نـابووتی وێـران کرابوو.

لە وێرانەیەکدا تەنیا چاوە دوورەکانی هەتاو گزنگی شادی و مەراقێکی خۆشیان ئەدایە روحم. تەنیا ئـەو لـەو دونیا پان و پۆرە مابۆوە کە بتوانێت بێ ئەوەی بە خۆی ئاگای لێبێت خۆشی بە خەون و خەیاڵ و ئەندێشـەکانم ئەدا، ئەو رۆژانە رۆژانی سورانەوەکانم بـوون بـە بـەر خەسـتەخانەی تـەواری و رووچـوونە نـاو تاریکییـەکانی سینەماکان، کە خۆم و سەر و روحم لەناو تاریکیدا رۆژانە چوار پێنچ دەمژمێر بزر ئەکرد، ئیدی ئەوکات مـن بەقەد هەموو تەمەنم مەراقی شەو و تاریکی بووم، تا بەرنامـەکانی ئـەو ژیانـە سـەخیفەی ئەوسـام گـۆڕی و رۆژانە ئەچوومە ناو پێخەڤە تاریکەکانی نووستن و شەوانیش لە تاریکیدا ئەکەوتمە نـاو حـەرف و وشـەی ئـەو نووسەرانەی کە لەو تەمەندا لەو شەوانەدا ببوونە خۆشەویسترین برادەر و نـزیکترین کەسـەکانم، تـا بـەیانیان دەستم لە ملیان ئەکرد و لە گەڵ پاڵەوانەکانیان تێر ئەگریام و پێئەکنیم و ژیانم ئەکرد، من نـەبووم وا ژیـانم لە تاریکییەوە بەسەر ئەبرد ، ئەوە هەمیشە من نەبووم خۆم ئەخزاندە قوڵترین پنتەکانی تاریکی، ئەوە جەستەم بوو ئەوکاتە ئەیویسیت لەبەر رووناکی شتەکانەوە هەڵبێت و پیس نەبێت، تاکە ئومێدێك بۆ جەستە و روحـم هەتاو بوو کە بەڵکو بتوانێت تا سەر لەو دوورییەوە هەمیشە خەونێك بێت و نەهێڵێت لەو رۆژگارەدا پیس بم.

ئەو تاکە رابەرم بوو پێی ئەگوتم خۆت مەدە بەر ئەو رۆژە، با پیس و بۆگەنت نەکات، منیش لە تاریکایەکاندا ختم بووم و ژیانی رۆژانەم تەنیا ئەو کاتانە بوون کە بەتاریکی لە سینەماکاندا بەرێم ئەکردن.

ئیدی شەوان من لەگەڵ هەتاودا لەو دوورییەدا دیالۆگی درێـژ درێـژمان ئـەکرد، لـە ناوهـەموو کتێبەکانـدا ئەمدیتەوە، هەمیشە لە گـەڵم بـوو و زۆر شـت و رووداوی پێئەناسـاندم. ئـەو نەبوایـە مـن لـەو تـاریکی و

روناکییەی ئەوسادا ئەخنکام، ڕەنگە ئەگەر هەموو شەوێك خۆی نەکوتابایە ناو کتێبەکانم ئەوە لە خوێندنەوەدا خنکابام، ئەگەر لە سینەماکاندا لەتەکم دانەنیشتبا ڕەنگە جارێکیان خۆم کوشتبا.

ئیدی من بە تاریکییەوە ئەژیام، ڕوحم تاریك و دڵم تاریك و ژیانم تاریك، تەنیا هەتاو مابوو کە لێنەگەڕێت تاریکییەکە بمکوژێت.

ئەبوایە من بەو هەموو تاریکییەی خۆمەوە نامەیەك بنووسم کە هەموو شەوق و ئیشراق و نور و ڕووناکییەکانی ڕوح و جەستەی خۆمی تێدا بنووسمەوە. ئیدی من بەو تاریکییەوە هیچ شتێك نەمابوو دەستی بۆ ببەم و گزنگێکی لێ قەرزکەم و بیخەمە ناو نامەکەوە. ( لە کوێوە بۆکوێ ) نەمئەزانی لە کوێوە ئەتوانم ساتێکی گەشی ڕوحم ببینمەوە؟ نەبوو ساتێکم نەبوو، تەنیا هەتاو مابوو کەلەو دوورییەوە خۆیشی نەیئەزانی کە تاقە سەرچاوەی ڕووناکی من ئەوە و هیچی دی نا، ئەبوایە نامەکەم پڕکەم لە نوری خۆشەویستی، ڕووناکایی ئەڤین و هەتاوی خۆشەویستی. ئەبوایە من لەوسەری برینەکانەوە بازدەمە سەر خۆشەویستی هەتاو، لە دەربەندی قەهرەکانەوە بۆ گەورەیی ئەو، لە بێڕەحمی ئەو گەردوونە پان و پۆڕەوە بۆ میهرەبانی چاوەکانی ئەو، ئەبوایە من لەو تاریکییەدا شتێك بکەم وەك موعجیزە وابێت بۆ ئەوەی بزانێت من خۆشم ئەوێت. عاشقی ئەوم و تەنیا و تەنیا ئەوم هەیە لەو گەردونە تاریکەدا. سەخت بوو بەو برینانەوە ڕێ لە گریان بگرم، سەخت بوو کە ئەو سوارانە دەوریان گرتبووم من وا نیشان بدەم لە شەڕدا نیم، سەخت بوو لەو بێڕەحمییەدا من ئاسۆیەك بۆ خۆشەویستی و میهرەبانی بکەمەوە، ئیدی هاوارم کرد ئەی هەتاو و ئەی هەنار و ئەی ڕووناکی، تەنیا تۆ ئەتوانی قودرەتی نامە نووسینم بدەیتێ ، تەنیا تۆ ئەتوانی موعجیزەیەکم بدەیتێ بۆ ئەوەی لەو شەوەدا نامەی خۆشەویستیت بۆ بنووسم، نامەی ئەو ڕوحە پارچە پارچەت بۆ بنووسم کە تەنیا لە هەموو پارچەکانیدا خۆشەویستی تۆ تاکە شتێك بوو ئومێدێکیان بداتێ بۆ کۆبوونەوەیان لە زەمەنێکی میهرەبانتردا.

ئیدی نزانم ئەو بوو یان ترسی نەدیتنەوە و ڕاکردن لەو ڕۆژگار و لەو وڵاتە و لەوشەڕەی کە خەریك بوو هەموو نیشتمانی خنکاندبوو وایان لێکردم بە حەیرانێك دەست پێبکەم و دواییش بکەومە ناو ڕامان لە هەموو کون و قوژبنەکانی ڕوحمەوە؟

ئەو کات ئەمویست هەڵبێم، لە وڵات و لە مرۆڤەکان و لە جادەکان و لە ڕۆژگارەکان و لە بەردەمی شەقامی تەواری و هەموو کەلێنەکانی دیکەی شار و وڵات و ڕۆژگار و هەبوون.

ئەمویست ڕاکەم و ئەو گزنگانەی هەتاو لە ڕوحمەوە هەڵگرم و لەگەڵ خۆم بیانبەم، یان ڕاستتر ئەو گزنگانە بوون ئەیانەویست بمبەن و لەم دەڤەرەدا ڕزگارم کەن و نەهێڵن لێرە بمرم.

ئیدی هەر ئەو گزنگانە شۆڕیان کردمەوە بۆ ناو هەستی خۆشەویستی و وشەیان پێڕژاندم، نامەیەکی پڕ خۆشەویستی و میهرەبانی خەم و هیواو خۆزگەیان بۆ هەتاو نەخشاند، بۆیە ئێستاش ناتوانم ئەو حەیرانەم بێتەوە بیر و وشەکانی دیکەی نامەکەم بێنەوە بەر چاو و هەوڵدەم بیاننوسمەوە. ئەو نامەیە نامەی من نەبوو، من ئەوسا وەك گووتم خۆم لە خۆمم نەئەکرد و شتێکی دیکە بووم، ژیانم و ڕوحم و هەبوونم نەخشێك بوو

ئێستاکەش من لێی تێناگەم، ئیدی ئەو روناکییە بوو کە هەتاو لە دوورەوە پێی ئەبەخشیم ئەو وزەیەی دابــووە روحم ئەو شتانە بکات کە لەو رۆژگاردا تاکە شتی جوانی من بوون و ئێستاش بە باشی بـیرم نایێنــەوە، ئیــدی گزنگەکانی نامەیەکیان پڕ کرد لە هەتاو و بە برادەرانم بۆم نارد، ئــەو برادەرانــەی هــاتبوون بــۆ دواجــار نــان خواردنێك و کۆمەڵێ وشە و قسە و باس و ماچ بۆ دواجار پێکەوە کۆمان بکاتەوە و لە دوای ئــەو دانیشــتنەدا دەستییان لێبەردەم و برۆم، بۆ کوێ خۆشم نەمئەزانی بۆ کوێ ، من ئەمەویست بچم لــە هــەتاو بگــەرێم، کــە زانیم لەو شارە و لەو وڵاتە ئەو هەتاوە نایێتە هەیوانەکەم ئەبوایە بچم رێگەیەك و بســتە خاکێــك ببینمــەوە و لەوێوە خەونێك ببینم لەگەڵ هەتاو.

مەودا نەمابوو خەون ببینم بۆیە ئەبوایە سەری خۆم هەڵبگرم و خــۆم بدەمــە دەســت قــەدەر، قــەدەرێك هــەر چۆنێك بوایە پێم میهرەبانتر بوو لەو رۆژگارەی تیایدا شەو و رۆژەکانم تیایدا ئەبوونە قوربانی.

هەمــوو روحم ئامادەبوو هەڵمبگرێ بەرەو ئاقارە ترسناك و نادیارەکانی ئەم گەردوونە دڵرەقە بەلاَم کە نامەکەی هەتاوم بۆ هاتەوە، لە گەڵ وشەکاندا هەمــوو هاوکێشەکان گۆڕان، سەراو بنی کردم و لە رەگەوە هەژاندمی:

( ئەی بۆنی سەفای بەختی من، ئەی ئەستێرەی ئاسمانی تاریکی مــن، ئەی هەتاوی باخچەکەم، ئەی گوڵە هەنار و چاو فریز، خۆشم ئەوێی با زوو پێت بڵێم خۆشم ئەوێی، روحــم ئــەوێی، چــاوەکانتم ئــەوێ و تــۆم بــە هــەموو شتێکتەوە ئەوێ، ببورە کە درەنگ وەلاَمم دایەوە و زەمــەنێك چاوەڕێبووم هەست و روحی خۆمت بۆ بخەمە ســەر کاغەز،

زوو پێت ئەڵێم خۆشمئەوێی پێش ئەوەی جانتات تێك نێیت و سەفەر بکەیت، پێش ئەوەی مــنیش کفنێك بۆ خۆم بدرووم و لە تەنیایی و دووری تۆدا بمرم، تۆ ناڕۆیت و سەفەر ناکەیت، سەفەری تۆ مردنــی مــن و باخچــەکانی دڵی منە، سەفەری تۆ بەجێهێشتنی منە لە وێرانەی روحێکی بێکەس و بێ مەئوا. ئــەی ماڵەکــەم بــۆ کــوێ ئەڕۆیت؟ بە چی لەدەست ئەم عەشقەوە رزگارمان ئەبێت.. بەسەفەر؟

زوو پێت ئەڵێم من خۆشم ئەوێی هەمــوو پارچەیەك لە جەستەم هاوار ئەکات ، ئەی ســەفا.. ئــەی بەختــەوەریم ئەی خەون و خۆزگە خوێنگەرمەکەم عاشقتم.

وەرە با لەم عەشقەدا دەست پێبکەین و ئەوەیان بکەینە سەفەری روحە پڕ لە وشە و شیعرەکانمان، ئەم عەشــقە بکەینە ناونیشانی رۆژگارمــان، مــنیش دێم و ئەموێ لە ناوەوەی تۆدا خۆم فەناکەم و خەندە و گریان و خۆشــی و ناخۆشیمان بەیەکەوە بەند کەین ، کە بە یەکیشەوە بەندن، دێم و خۆم داوێمە ناو چاوەکانت لەوێ هــەڵمبگرە و هەمووشەوێ بەسەر خەفەت و حوزنەکانی خۆتدا بمگێڕە و مــنیش بۆیــان ئەبمــە چــیرۆکنووس و ئەیاننوسمــەوە و ئەیانکەم بە چیرۆکی بەختەوەری کائینێکی دی.

مەرۆ گیان، من دێمە ناو برینەکانت و بە پەنجەکانی خۆم و بە ماچ و بە لێوەکانم یەکەیەکە سارێژیان ئەکــەم و خۆشترین ئاواز ئەکەم بەبەر حەیرانەکانت و ئەیانکەم بە داستانی عەشقێکی ئەبەدی تژی لــە بــۆن و بخــور و

کەنین و ماچ و دەسبازی، وەرە من خەڵوەتێك لە عەشق بۆ سەرەکاسەکەت هەڵئەدەم و لە کوێستانەکانی خۆمدا لەبەر نسێترین سیبەر و هاژەی رووبارترین هەستدا خەونەکانت بۆ ئەکەمە راستی.

خۆشمئەویێی، ئەی روحی من، عاشقتم گیانی گیان و سێبەری هەتاوی خەونەکانم.

خۆشمئەویێی و بۆت ئەمرم، سەفەرمەکە بەوسەفەرەت مەمکوژە، وەرە با عەشقت وێرانم کات، وێرانبوون لە عەشقی تۆدا روحم ئاوەدان ئەکاتەوە، گیانی گیانم.. من شەو نیە لەگەڵ تۆدا پیاسەیەك تا ئەوسەری سەفا نەکەم و تا ئەوپەڕی دونیا دەستت نەگرم و ماچت نەکەم.

من دەمێکە چاوەڕێبووم نامەیەکت بێت و تیایدا خۆم، روحی خۆم بتەقێنمەوە و وەك کانیاوەکەی دەنگارە ئاوی هەناوم برێژمە سەر روخسار و روحت و پێت بڵێم .. دڵۆپ دڵۆپ ئەموێ برژێمە ناو گیانت، قەترە قەترە بمخۆوە و فرمێ کە لەسەر لێوەکانت.

چاوەڕێت بووم ئەی ئیمانم، چاوەڕێم ئەکردی بێیتو هەر بە وشە هێرش بکەیتە سەر روحم و دڵم و دەروونم و هەمووپارچەکانی لەشم داگیرکەیت، چاوەڕێبووم بێیت و لەو عەشقەدا رۆژانە بمکوژیت و زیندووم کەیتەوە. ئێستاش کەهاتی ئەوە خاکی چاو و سینگ و مەمك و تەواوی جەستەم چاوەڕێی هێرشەکانتە بە شعر و خۆشەویستی.

وەرە با لەخۆشەویستیدا خۆمان فەنا کەین، فەنابین لەو دونیایە و لە خۆمان، ئەموێ لەگەڵ تۆدا رەنگ و رووی خۆشم بگۆڕم و ئاوێتەت بم و ئاوێتەم بیت.

زوو پێت ئەڵێم خۆشم ئەوێی تا زوو پاشگەز بیتەوە لە سەفەر و خۆدانە دەست قەدەر، من و تۆ قەدەری یەکین و با لە قەدەری خۆماندا ختم بین، من لە تۆ میهرەبانتر شك نابەم بۆ عومرم و نایەڵم کەسیش وەك من رەحم بکا لە کوشتنت!

وەر با بەو عەشقەوە یەکدی مەست کەین و بیر بکەین چی لەو دونیا شێواوە ئەقەومێت. من قەدەری تۆم و راکە بەپەلە خۆت بکە بە باوەشمدا، وەرە و بیر مەکەوە لەباوەشی مندا چیت بەسەر دێ، گومان تورِ هەڵدە و بیر مەکەوە، بیرکردنەوە لە باوەشی مندا ئەزیەتە، وەرە و بێ بیرکردنەوە بزانە چ میهرێك و چ خۆشنوودییەك چاوەڕێتە.

ورە ئازیز.. وەرە ئەی دۆست .. وەرە ئەی روح

وەرە ئەی دەسگیرانە شیرینەکەم وەرە با هەڵتکرم و لەو دونیایە دەربازت کەم، وەرە لەگەڵ مندا با بفڕین، بەو دونیای خۆشەویستییەدا بفرین و دڵنیابە لەگەڵ مندا وەڵامێك بۆ پرسیارەکەت ئەبینییەوە، تێئەگەیت لە کوێوە بۆکوێ ئەتگەیەنێتە بەر ئاسمانی لە ( عەشقەوە بۆ عەشق )

هاتم و خۆم هاوێشتە باوەشت ئەی مەئوای روح و چاو و جەستەم، هاتم و بێ پرسیار و بێ گومان، هاتم و تەنیا شعر و روح و وشەم پێبوو بتدەمێ، هاتم و رووت.. وەك دارێکی رووتەڵە، تا لە نوێوە لە باوەشی عەشقی تۆدا

گەلاٚ بگرم و سەر لە نویێ لە دایك ببمەوە، هاتم و هەموو روحم ، هەموو بیرم، هەمووجەستەم خەون بوو بە تۆ و باوەش و چاوە رەشەکانت، من هیچم نەمابوو ، ئەمویست لەگەڵ تۆدا ئیدی دەست بە ژیان و پیاسە بکەم بەکوچەکانی قەدەردا، من هیچ رۆژگارێکی ئەوەندە میهرەبانم نەدیتبوو ئەوەندەی لە هەیوانی وشەکانی تۆدا وەك با و زریان خۆیان لە روحی مندا هەڵسوی و منیان ئاوێتەی تۆ کرد، تازە زمانم کرایەوە و دڵم لە پەنچەرەیەکەوە ژیانی بەدیکرد.

هاتم و گووتم هەڵمبگرە وەك زریان و رەشەبا و لە رەگەوە بمژیێنەوە ئەی بەختەوەری، ئەی کائینێك لە خەون و هەتاو و باران و جوانترین وشەکانی ئەم گەردوونە، من هیچم ناویێ من تەنیا و تەنیا ناوی تۆ و تەمەنی تۆ و وشە و حەرفەکانی تۆ، تۆش بمکوژە ، سەرخۆشم کە، بیهۆشم کە ، ئەی جوانترین قەدەرم، من تەسلیمی تۆ و چاوەرەشەکانتم ، ئەی رازاوەترین موسیبەتم با لەتۆدا فەنا بم و سەرلەنویێ دەست بە عەشق و ژیان و نووسین و یادگاری بکەمەوە. لەگەڵ تۆدا جارێکی دی لە نوێوە گویێ بۆ گۆرانییەکان هەڵخەم و لەگەڵ تۆدا لەگەڵ سرووشت و دونیا تەبا ببیمەوە، لەگەڵ تۆدا زەوقی شاعیرانە و میزاجی دەرویشێکی فەنابوو لە عەشقت و حەزی دەروێشێکی پڕ لە شەتحەی گزنگی چاوەکانت نویێ ببمەوە.

هاتووم و پڕم لە حەزی کوشتن لەناو لەپەکانی تۆدا، پڕم لە حەزی مردن لە ناو تاریکایی چاوەکانتدا، پڕم لە عەشقی فەنابوون لە باوەشی تۆدا, وەرە ئەی خودام وەرە و فەنام کە لە ناو میهر و عەشقی خۆتدا، وەرە من هاتووم سەختترین شەڕەکانی خۆم بە تەسلیبیمیەوە لەگەل عەشقی تۆدا بکەم و لە ناو دڵی خۆتدا بمکوژە.

ئیدی دوای ئەو نامانە هەستام و خۆم لە لوولەی تفەنگەکانی نێوان بازگەکانی نێوان شەقلاۆە و هەولێردا، هاتم و لە رێگەدا ملم لە موو باریکتر لە ژێر دەستی چەقۆ وەشێنەکان کە لەو رۆژگارەدا خوێنی یەکدییان ئەخواردەوە، بەلاٚم ئەو دەمە هەموو دونیام باوەشی هەتاو بوو و مردنیشم لەهەر کوێیەك با ئەوە لە ئامێزی ئەوەوە ئەکەوتمە سەر زەوی دڵەکەی. بۆیە باکم نەبوو، لەو سەفەرەدا بازگە سەوزەکان یان زەردەکان ئەمکوژن، گەردوونیش بەو گەورەییەی خۆیەوە ببووە سینگی ئەو و منیش تاکە رێبواری بەختەوەری ئەو رۆژگارە نابووتە بووم. هاتم و پێم نایەوە خاکێك کە هەمیشە بۆنی ئەوم لیێ ئەهات، هەمیشە رەنگەکانی لە رەنگی چاو و سینگی من جیا نەئەبوونەوە.

هاتم و یەکەم باوەش بەر دەرگەی ئەو ئاواهییە خنجیلانە بوو کە یانەی رۆشنبیریی شەقلاۆەی لە ئامێز گرتبوو و لەوێوە لەگەڵ بخورە هەڵگیرساوەکانی سینەی هەندرێندا کەوتمە ناو بۆنی سرووشت و دەسگیران و گەڕانەوە بۆ پنتی لە دایکبووەنەوەیەکی دیکە دوای بیست و شتێك ساڵ.

گەورەیی ئەو رۆژانە لە هەموو شتەکانی دابوو، لە سێبەری ناسکی دار هەنجیر و سپیندارەکان، لە شعر خوێندنەوەیەك ، لە چاوەڕوانییەکی بەردەرگەی مەکتەبی کاوێس، بەردەرگەی یانەی رۆشنبیریی و قومە ئاوێك لە کانی خومان و دیتنێکی هەتاو بۆ چەند چرکەیەك تا ئەگەیشتە ئەو سەری شەقامەکە و لەوێوە بە پاسێك

بەرەو ماڵ ئەبۆوە و لە چاوان بزر ئەبوو، کەچی ئەو هەر لە دڵی مندا بوو و هەمیشە یەك چرکەش بە جێی نەئەهێشتم.

ئیدی لەوێوە ژیانم هەمووی بووە پەڕە کاغەز و نووسینەوەی هەست و سۆز و بیر و عەشق و خۆشەویستی و شعر و ژیان لەسەر کاغەز.

نامەکان تاکە ژیانکردنێکی رەها بوون لەناو بێ تەلەفۆنی و بێ پەیوەندیکردن و بێ دیتن و بێ ئاوەدانی.

بەڵام دڵم هەمیشە چراخان بوو، ئەو هەمیشە لە ناو چاوانمدا هەڵدەبوو و لە شەوان و رۆژانمدا ئاگادار بوو کە من هەمیشە خەریکی نووسین و نووسینەوەی تامی ژیان و خۆشەویستی و عەشق و دونیا بووم.

ئێمە چارمان نەبوو ئەبوایە عەشقمان فەنا کەینە سەر نامەکان، لەو زەمەنە بێڕەحمەدا هیچ ئەوەندەی کاغەز و پەنچە و قەڵەم و جگەرە بۆ من میهرەبان نەبوون، لەگەڵ جوانترین و گەرمترین وشە و هەستەکاندا هەمیشە لە ژواندا بووم، یان راستتر من ژیانم ببووە نووسین و نامە و وشە و شعر و ناسکی و بە سودفە تێکەڵی شتەکانی دیکەی دونیا ئەبوومەوە.

من بەتاو بەناو عەشقدا ئەڕۆیشتم و وەك ئەسپێکی بەتاو و ئازاد و ئازا، بە ناو جوانترین بەیارەکانی عەشق و وشە و هەستەکان غارم ئەدا و ماندوو نەئەبووم و نەئەوەستام.

بە تامترین و لەززەتترین دەستەواژەی ئەو کاتەو ئەوە بوو کە پێم ئەگوت ئەی هاوڕێی شعر و وشە و تەمەنم!

ئیدی من لەوێوە کەوتمە سەفەری وشە و سەفەری شار و ناوچەکانی کوردستان و روحم دەرژایە سەر کاغەز، هەموو هەوڵەکانم ئەوەبوون لە قوژبنێکی ئەم شارەدا ببینمەوە، لە هەر دەرفەتێك ئەگەڕام بۆ دیتنی ئەگەر لە دوورەوەش بوایە.

تا ئەو رۆژەی من دوای سەفەری هەولێر و مەسیف و شەقڵاوە و خەلیفان و دیانا دەرفەت بوو بێم و لە گۆڤەندی برای برادەرێکەوە ببینمەوە، هەموو دڵم گۆرانی بوو کە ئەیبینمەوە، هەموو رۆحم شعر بوو ، هەموو گیرفانەکانم نامەبوون، بۆ ئەو، کەچی لە رێگەدا وەرگەڕانی ئەو هەسپەی برادەرەکەم لێی ئەخوڕی هەموو خۆزگەکانی وەك شکاندنەوەی گوڵە هەنارێك تێکوپێکدان.

نەمدیتەوە و لە نێو خوێن و بەنجدا لە خەستەخانەدا من کەوتمە غەیبوبەیەك کە لە تامی دیتنەوە و مژینی گەردەنی ئەوی کردم لە دوورەوە. رۆژی دواتر و دواتر و دواتریش لەگەڵ هەموو هەوڵە عەبەسییەکانم بە دیداری نەگەیشتمەوە.

ئەبوایە بەردەوامیش بم لەسەفەرەکەی خۆم و بە سواری ئەسپێکی دیکەی چاو زەعیفەوە بچم بە کۆمەڵێ جوگرافیای کوردستانەوە شاد بم. ئیدی لە کۆیەوە دەستم بە نووسینی نامەکان کردەوە و ئەمجارەیان دەفتەرێکی خەتدارم پڕکرد لە قسە و خۆشەویستی و شعر و روح و هەنسك و فرمێسك و گۆرانی و تابلۆ و داستان و ئەفسانە و هەتاو و گوڵ و پەپوولە و باران و رێحان و مێخەك و بخور و جوانی.

بیست رۆژ هەر رۆژەی لاپەڕەیەکی دڵ و لاپەڕەیەکی روحی خۆم ئەخوێندەوە و وشەی چـاو و دەسـت و پەنجـە و دەروونم ئەخستنە سەر کاغەزەکان. تا ئەورۆژەی گەیشتمەوە شار،

دەفتەر تەواو ببوو چ لاپەڕەیەك نەمابوو خوناوێکی دیکەی روحم لەسەر خۆی وشك کاتەوە.
ئیدی من بێ ئاگابووم لەوەی گوڵی عەشقی من لـە سـینەی ئـەودا ئەوەنـدە بـۆنی کـردووە تـا ماڵەکـەیانی پڕکردووە، نەمزانی ئەوەندە خوناوی گرتووە تا هەموو کەس بیبینێ، نەمزانی شعر نەیتوانیوە ئەو عەشـقە لـە سینەیدا بشارێتەوە و گزنگی چاوەکانیشی فەزحی نەکەن.
ئیدی من بێئاگا بووم کارەساتەکان دەمێکە هەتاویان لە بوخچەیەکی تەنهای بێ وشە و شـعردا پێچـاوەتەوە و خەریکە بەرەو جەهەنەم رێ ئەگرێت.مـن بێئاگـابووم لـەو کاتـەوەی مـن لەسـەر دەفتەرەکـە دونیایـەکم لـە خۆشەویستی و عەشق و خۆشەویستیدا بۆ دروست ئەکرد ئەو لە ناو ئـاگردا ئەسـووتێت و بـە کارەسـاتێکەوە خەریك بوو کە سەری دونیا و بنی دونیای عەشقی لێ کردبووە ئاگر.
من بێئاگا بە دەماغی عاشقێکەوە دونیام رەسم ئەکردەوە، بێئاگا بـە زەوقـی شـاعیرێکەوە پلانـی جیهـانێکی ئەفسووناویم بۆ دائەنا.
ئەبوایە من ئەو رۆژەی برادەرەکانم ماچ کردن و خەریك بوو بۆ دواجار دەست لەیەکدیبەوە بـەردەین ، مـن ئـەو کاتە ئەو نامەم لێ ستاندبانەوە و بمگووتبا برۆن بێ نامە و بێ دڵ و بێ روحم. ئەبوایە بمزانیبایـە مـن کـەڵکی عەشقم نیە، ئەو دونیایە بە من رێکناخرێتەوە و رۆیشتبام، رۆیشتبام و عەشقی هەتاویشم بۆ قەدەرێکی دیکە هەڵگرتبا. ئەبوایە من وام کردبا و بمزانیبایە درێژترین ساتی خۆشی ناکاتـە چـاوترووکانێك، بـەڵام نـەمزانی.
ئیدی لەو بێ ئاگایەدا خەبەرم بۆوە و زانیم من لە نابووتییەکەوە ئەژیم کۆتایی بۆ نیە، ئەمە قـەدەری منـە و ئەبێت سەودایەکی دیکەی لەگەڵ بکەم.
ئەبوایە چاوەڕێکەم سووتانی هەتاو تەواو بێـت، بـزانم خۆڵەمێشـەکەی چـیم پێئـەڵێ و منـیش ئـەتوانم لـەو مشکیبەدا چی بۆ بکەم و چۆن روحی بەبەردا بکەمەوە.
ئیدی نامە نووسینیش رەنگی دیکەی وەرگرت و وشەکانیش ئاوازی دیکەیان لێئەزا، ئاوازی تەنهایی و نامۆیی و بێزاری و خەمێکی قوڵ قووڵ. ئێمە کەوتینە ناو ئاگر و ئەبوایە لە سووتاندا ئەم جارە پەیوەندی بکەینەوە. بە سووتان لە یەکدییەوە بگەین، بە دووکەڵ و بۆکرۆزەوە یەکدی بناسینەوە.
من لەو سووتانەی هەتاودا بوو لەناو ئەودوکەڵە بوو دوای نامە مشـکی گرتووەکانمـان مـن بڕیـاری سـەفەری دەڤەرێکی دیکەی خەم و گەڕانم دا لە خۆشەویستی و چاوەکانی، گـەڕان لـە گزنگـەکانی لـە جوگرافیایـەکی دیکەدا.
بەو سەفەرەم ئومێدم خواست دونیا لەگەڵی میهرەبانتر بێت و دەمیش وردە وردە بیکاتەوە بە کائینێـك توانـای دیتن وتۆقەکردنی منی هەبێت.

لەویوە من بوومە پارچەیەك لە كاغەز و نووسینی نامەی درێژ درێژ كە تائێستاش نامەكان تامێكی سەیر و خۆشیان هەیە ، ئەو نامانەم ئەو رۆژگارە بۆ تریفە ئەخوێندنەوە، بەویشم گووتبوو ئەمەوێت هەتاو بكەمەوە بە كائینێك كە توانای خوێندنەوەی نامەكان و نووسینەوەی شعری بێتەوە بەر، لەگەڵ تریفەدا كەوتینە سەفەرێكی دیكە لەناو ئەو سەفەرەی خۆمدا، هەتاو بوو هەڵێگرتین و ئێمەی فڕاند كەچی دوایی هەتاو نەیتوانی بمانهێنێتەوە سەر زەوی و باڵمان بكاتەوە، ئیدی نە ئەو بۆوە ئەو كائینەی بتوانێت تۆقە لەگەڵ روحم بكاتەوە و نە ئەو كائینەی بمهێنێتەوە بەر هەیوانەكانی.رەنگە لەوساتانەدا من پتر وەك عاشقێكی بەكردارەوە ژیابم، ئەگەرچی كردەی نووسینەكان بەردەوامبوون بەڵام لەگەڵ یەكەم ماچ و دۆزینەوەی كائینێك كە لەنزیكەوە لە بەختەوەرییەكان و نهێنییەكانت نزیك بكاتەوە هەموو دونیای گۆڕیم، ئیدی من فڕیم و نەنیشتمەوە، تا ئەو لەحزەیەش جەستە و روحم هەر لە فڕینن، دۆزینەوەی ئەو ساتانەی كە لەنهێنییەكانی خۆت نزیك ئەكەنەوە زۆر كەمن ، من رەنگە تەنیا لە نووسیندا گەیشتبمە نهێنییەكان و نەشگەیشتبم، بەڵام لەگەڵ تریفەدا لە نهێنییەكانی خۆم و هەتاو و نووسینیش گەیشتم، یان رەنگە تێشنەگەیشتبم و ئەو كات زیاتر دركم بەو بەختەوەرییە كردبێت كە لە زۆر شتەكاندا هەستم پێ ئەكرد ، وەك ماچ كردنێك، نووسینێكی سەر دەفتەرەكان ، خوێندنەوەی رۆمانێك لە رۆژێكدا، پیاسەیەك، سەرپەلەییەك لەگەڵ تریفەدا ، زانینی ئەو شتانەی لە ناوەوەمدا خۆیان ئەشاردەوە و بەشەرمەوە رووبەڕووم ئەبوونەوە، ئیدی ئەو فڕینە زۆر شتی لە یادگەدا كاڵ كردمەوە و زۆر شتیشی لە جەستە و روحمدا دركاند.

ئیدی ماوەی نێوان من و هەتاو تا ئەهات زۆر ئەبوو تا ئەو پنتەی دەلیفە نەما بەیەكەوەمان كۆبكاتەوە، كە سەیری نامەكان ئەكەم ئەبوایە ئەو كات من زووتر تێگەیشتبام كە هەتاو لە نهێنییەكانی رائەكات و هەمیشەش ناگاتە بەختەوەری و سەفا، ئەو هەموو هەوڵ و نامەكانی بۆ ئەوەبوون تادێت و پتر خۆی لە نهێنییەكانی بشارێتەوە، تا بێت لە من كە گەورەترین نهێنی ئەوبووم بزرم بكات و لەناوم ببات، ئەو خەزنەی نهێنییەكانی كلۆم دان و كلیلەكانیشی دانە دەستی كوڕێكی دیكە و ئەویش پێی گووت من بۆ ئەبەد ئەو كلیلانە بزر ئەكەم.

ئیدی من نەنیشتمەوە و هەتاویش نەفڕی، من رۆیشتم و بەردەوام بووم لە كردنەوەی نهێنییەكان و زۆرجاریش سەرسام ئەبووم بەو خۆشەویستی و كەیف و زەوقەی لە لەش و خەیاڵی خۆمدا دركم پێ ئەكرد.

هەتاو وەك نهێنییەك كاڵ ئەبۆوە و كەشف ئەبوو، تریفەش زیاتر و زیاتر نهێنییەكانی ئەڕژاندنە دونیام، دونیای جەستە و سۆز و بیر و رەفتارەكانمەوە، هەستێكی سەیر دوایی هەموو نهێنییەكانی داگیركردم، لە ساتەكانی سەفادا هەستم ئەكرد تریفە ژنی منە، ئەو بە ژنبوونەی نهێنییەكی زۆر چێژدار و كوشندە بوو، سەیر بوو بەوەی هەستێك لەناوتدا جێگیر بێت و بڵێت ئەو كچە روحی تۆیە ، ژنی تۆیە ، دونیای تۆیە ، هەستی بە ژنبوونی ئەو، جەستە و دڵی بردم، بەرەو كردنەوەی ئەو نهێنییە و بە رۆشنكردنەوەی ئەو ساتانەی هەستم ئەكرد لە سەفادام.

ئیدی فریم و تریفەش لە باوەشمدا وەك جوانترین ژنی ئەو کەونە، وەك تاقانــەترین خۆشەویســت، وەك نهێنــیترین بەختەوەری و تاکە ژنی ئەم دونیایە لە روحمدا جێگیر بوو. لەوێوە تا ئەمرۆکەش ئەو فرینە هەم چــێژ بــەخش و کوشندەیە.

رەنگە تێگەیشتن لە لەزەت و کوشندەیی و فرین بەناو نهێنییەکاندا ئەوەنــدە ئاســان نــەبێت بــۆ تێگەیشــتن و شیکردنەوە.

ئیدی ژیان لەگەڵ نهێنییەکاندا، ژیان لە بەختەوەریدا، بێ ترس لــە مــردن و بــەیانی و دوارۆژ وێســتگەیەکی رۆشنی ئەو رۆژانە بوو کەتا هەتایە درێژەیان هەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

من زۆرێك لەو نامانەی بۆ هەتاوم نووسین بە دەستی نەگەیشتن، لەبەر گەلێ هۆکــاری گــەورەو بچــووك، بــەلاّم دیتاریشە بەوەی دوای ئەوەی بریاریدا لەگەڵ کەسێکی دیکە کاروانی ژیانی بداتە دەست قەدەرێك دوور لە من، من بڕوام بەوەبوو لەدوای بریارەکان پێویست ناکات دوودڵــی بکــەم لــە بریارەکــانی، لێ دیســانەوەش گــۆڕینی جوگرافیا و بیر و باوەڕ و دەم و شوێن و سەوداییەکان بەس نەبوون بۆ ئەوەی دڵەکان و روحەکان خاڵیکەنەوە لــە یەکدی و یادگارەکان وەك تارمایی بەشێك لە روح داگیر نەکەن، بۆیە لەگەڵ هەر ئاماژەیەکی دوور کــە ئــەکرا لە پنتێکدا وەك تارمایی پێکەوە کۆمان بکاتەوە، ئەوا دونیایەکی شێواوی دروست ئەکرد کە ئاسان نەبوو تێی بگەین، یادگارەکان و نامە نەنێردراوەکان وەك ئەو تەزرانە بوون کە لە گەڵ گەوراەیکی بەهاردا ئــەبارین و لــە گوڵ و کوریکەکانیان ئەدا، لەگەلچ جوانی خۆیاندا سەدان و هەزاران خونچەیان وێران ئەکرد.

بۆیە ئاسان نەبوو لەو پنتانەدا بتوانم خۆم بکەمەوە و بتوانم بەبەرچاوی گەردوونەوە دووبارە ئــەو نامانــەت بــۆ بنێرمەوە کە بەدەستت نەگەیشتبوون، بۆیە لە نێوان من و ئەودا هێلێك لە هەســتی جۆراوجــۆر چــنرابوو کــە تێگەیشتن لەو هێلە ئاسان نەبوو. بەهیچ شێوەیەکیش ئاسوودەی نەئەکردم. ئیدی ئەبوایە لەگەڵ فەنیدا باسیان بکەم و بلێم وەرە دوا شیعری خۆمت بۆ بخوێنمەوە:

لە نامەیەك کەبەدەستت نەگەیشت، بۆم نووسیبووی

ژیان لەوەسەیرترە کە من وتۆ ئەیکەین

من لەوە سەیرترم کە تۆ بمناسی

تۆش لەوە سەیرتری کە شعرێك تەفسیرت کات

نا ئەزیزم نا ئەو نامەیەت بەدەست نەگەیشت و تۆش هەر وەك کۆترە شینکەیەك تــەنیا ســەرگەرمی خــواردنی دنکە گەنمەکانی ئێوارەیەك بوویت

کە من تیایدا ئەکوژرام و تامی پەلکە شەنگەبییەکم ئەکرد لە برینەکانمدا

ئەو نامەیەت پێ نەگەیشت عەزیزم کە ئەبوایە من روحی خۆمی نتێدا بنووسمەوە بۆ قەرشێك لــە بــەیارەکانی روح

ئەبوایە بمنووسیبا چیرۆکی پەرستنەکانی خوا و بە پیرۆزکردنی هەموو دنکەکانی عەشقیش لای مـن بوونەتـە ئەو ئێوارەیەی کە رۆژی تێدا ئاواناییێت

من ئەبوایە بنووسم بە خوێنم بنووسم بۆ ئەوەی باوەڕبکەی عەشق ئەوەنیە من تێیبگەم

عەشق ئەوە نیە مەراقە کچگە و گەورەکانی خۆمی تێدا بنووسمەوە

من نزانم بۆ ئەبێت سێبەرێچك لەمەرگ ئەبێت هەمیشە بە هەناسەکانمەوە بێـت و پـەرژینێك لـەنێوان مـن و حەشیشەی ژیان دروست کات

بۆ ئەبێت تۆ هەمیشە من بە دوای خۆتدا وەك وەهمێکی شیرین بکێشیت وتاقەتی فرێدانت نەبێت

بۆ ئەوەی تا ئێستاش لەو نامانە بترسیت کە پێت ناگەن

کە پێت ئەگەن و ناوێریت وەك خۆیان بیانخوێنیتەوە

بۆ ئەبێت ئەوەندە سادانە باسی عەشقی ژن و مێردێك لە خۆتدا بکەیت بۆ ئەوەی کۆترەکـان بڕوابکـەن ئـەوان تەنیا مەراقی گەنم و خۆراك نین و جوانییەك پەڕە شینەکەیان بپێچێتەوە

عەزیزم خۆزگە لەوەیان جوانتر ئەبوویت لـەوەی هەمیشـە وەهمێچـك بـە دوای خۆتـدا بکێشـیت کـە توانـای هەڵگرتن و فرێدانت نیە

عەزیزم ئەی کۆتری ئێوارەیەکی دوور دوور دوووور دوور لە چاوی من و

دوور دوور دوووور لە روحی من و دوور دوور دوور لە جەرگی من

بەقەد هەسارەیەك گەورەیت و بەقەد وشەیەکیش پڕخرۆشان

من نامەکانم ئەنووسین و ئەمدانە پەلکی مووتکێك و لەناوتاریکایی دو پەلکە رێحاندا ئەمشاردنەوە

من دڵم ئەکردە ناو لیمۆیەك و

جەرگم ئەخستە پرتەقاڵێکەوە

من خۆم ئەخزاندە تاریکایی شەوێك کە قەت هەتاوی نەدیبێت و

کەچی هێشتاش تۆ هەر ئەدیتمەوە

من لە تۆ بزر نەئەبووم و هەمیشە لەناودێرێکی لاوازدا ئەبوومە حەرفێك و لە پشـتی دەفتـەرێکی بێڕەنگـەوە ئەبوومە نوقتەیەك

ئای عەزیزم چەند کوشندەیە نەتوانی تەرمی عەشقێك بسووتێنیێ

تەرمی دڵێك بکەیتە خەڵوز

روحێك بخەیتە تەنەکەیەکە وە و

هاوارێك لەکیسەیەك بپێچییەوە و هەموویان لە پشت خۆتدا لەبەر بارانێك یان هەتاوێك بەجێبێڵێ

ئەوە من نەبووم ویستبێتم .. پەرچەمێك لە شعرەكانی منەوە بۆ تۆ دروست ئەكەم
ئەوە من نەبووم ئەمەویست گمینەكانی من بە بانگی خۆتەوە گوێ لێببیت
من ئەونامانەی بۆ تۆم نووسین بەدەستت نەگەیشتن
ئێستاش نە تاقەت و نە روح و نە سەبەری خورافەیك ماوە لەدین و سەربوردەكانی عاشقە توڕەهاتەكان هەڵگرمەوە تا بیانكەم بە پێناسەیەك بۆ تۆ و بۆ خۆم
من لەتۆدا نزانم هەروەك نامەكان نەگەیشتمە بەردیدەنیت یان نەگەیشتمە بەر سۆزی قەڵمێكتەوە
من ئەوشتانە نزانم
من ئەوانەم بیر نەچوونەوە كە ئەمەویست لەگەڵیاندا بمرم و روح بدەم تا لەبەر خورەی دیوانێكی شعریتەوە هەڵسمەوە و دەست بكەمەوە ملی خۆم و گەردەنی خۆم ماچ كەم و دەستەكانی خۆم لەناو پەنچەكانمدا لە سۆز بزر كەم
من ئەوە نەبووم بەسێیەری كەسێكەوە بنووسێم و هەر لەناو نم و باران وتەمدا پەیڤەكانم فرێدەمە ناو جەرگتەوە

من ئەمزانی مرۆڤ و گوڵەكان كە بە وشە، ئازیز نابن و هەرگیزیش بە شعر بالاّ ناگرن
من لەنامەیەك كە بۆمم نەناردی نووسیبووم برۆ ئەی پەری برۆ ئەی زەری برۆ نێرڤانا
برۆ بۆ ماڵێك كە من ژمارەی خانوو و ژمارەی تەلەفۆنەكەی نزانم
ماڵێك كە بە ئەنتەرنێتیش داتایەكی كەشف نەبێت
برۆ من نووسیبووم دونیا بەقەد ئەڵقەكەی دەستەراستی من بچووكە

دەبێ ئیدی من بەردەوامبم لە نووسینی نامەی دیكە وئەو شەڕە بەردەوام كەم
كە لەگەڵ تۆ و خوا و خوارفەكان دەستم پێكردەوە و هەرگیزیش بە ئومێدی سەركەوتن نیم
هەرگیزیش بە ئومێدی جوانبوون نیم
هەرگیزیش بە هیوای شینبوونی دڵم نیم
ئەبوایە من لە تامی شەڕاب و تامی دونیا وەك یەك شارەزا بام و هەردووكیانم بە زەقنەبووت نەزانیبا
ئەبویاە من جیاوازی نێوان نامە نووسین و تامی هەنگوینم كردبا و هەردووكیانم بە شیرین نەزانیبا
ئەبوایە من زۆر شتم زانیبایە كە لەكاتەكانی خۆیاندا نازانرێن
هەمیشە وایە ئەزیزم تەمەنێكی داهاتوومان گەرەكە بۆ ئەوەی لە دوێنێمان بگەین
هەمیشە پێویستیمان بە سەربوردەیەك هەیە بۆ ئەوەی لە چیرۆكی عەشقەكانمان بگەین
هەمیشە پێویستیمان بە روونكردنەوە هەیە بۆ ئەوەی لە شعرەكانمان بگەین

هەمیشە پێویستیمان بە ترس و تۆفان هەیە بۆ ئەوەی لە ژیان بگەین
لێ هەرگیز خەمی ئەوانەم نیە ئازیز
بەقەد ئەوەی من لەخەمی گەڕانەکانی خۆم و سەفەری جەرگی لەتلەتی خۆمم
من هەر ئەمشە و شعرم بۆ سێبەرێك نووسی گووتم ئەی سێبەر خاتوون
ئەی سێبەر گیان وەرە و وەك پەنجەیەکی میهرەبان قدیلانێی ئەو عاتیفە دڵبەرە بکەوە
وەرە و بەو دەستە نەرمانەت مەساجێك بۆ دەمارە گرژەکانی ئەو شیعرەم بکە
وەرە و وەك تەمێکی گەرم پەیڤەکانم خاو کەوە
کە خەریکە وەك نامەیەکی خۆی ئەکات بە باخچەکانی بێهۆشیمەوە

لێ سێبەر خان بە میهرەبانی خۆیەوە گووتی بگەڕێ ئەی کوڕی سرووشت با دار و بار و بەرد و بەفرەکان بەناوتدا گوزەر بکەن و لە خۆت بنۆڕە
لە خوێناوی جەرگ و روحی هەلا هەلات بڕوانە جوانییەکانی بەژنی قەدەرت و چاوی منداڵێك کەلەسەر دڵی تۆدا چاك ئەبێتەوە
لەو قوژبنانە بگەڕێ کە تیایدا هەم جوان و هەم میهرەبان و هەم خاتوونانە تەماشای بێسەروبەری ژیان و تەمەن ئەکەیت
گووتم سێبەر گیان .. گیانم پڕە لەوردە گریان و خوێنی دنکە هەنارەکان
روحم پڕە لە نغرۆبوون و سەفەر و لەیادچوونەوە
جەرگم پڕە لە تەم و وشە و نامە
دونیام پڕە لە تۆزی ئەزیزان و غوربەتی ئەفسانەکان
من ئەوەندە بچووك بوومەتەوە ئەوەندەی گۆرانییەکی کورت تام لە هەبوون وەرئەگرم و هەندەی دەسپێکی تەوزیحی شعرێك خەفەت ئەچێنم
سێبەر گیان من ئەوەنیم لەناو نامەکاندا گیر بخۆم و نەتوانم لەگەڵ ئەو نامانەی کە بە ئەزێك و بە سنوورێك ناگەن دڵ پڕ بم
من نزانم ئەوشۆ لەگەڵ تۆدا بەشەڕ دێم و حەیف بۆ بێسەروبەری هەموو شتەکان ئەخۆم
مخابنێك بۆ هەموو درۆیەکان ئەڵێم و نشزانم سەرەنجام ئەبێت بەرەو کوێ بفڕم

لە نامەیەکدا بۆم نووسیبووی ئەی ئەزیز
من تووڕەم لە هەموو دەرسەکانی مێژوو و ماتماتیکەکان کەناتوانن تەفسیرێك بدەنە ئەو شعرە دەستکردانە
ئەو خۆشەویستیانەی بۆ ئەوەی خۆیان ئیسبات کەن ئەبێت سوێند بۆ ئەزیزانی یەکدی بخۆن

ئەبێت سوێند بخۆن کە ژن و مێردەکانی خۆیان خۆشئەوێت و کەسێك نیە موستاهیلی جوانییەکی دیکە بێت
من تورەبووم لەعاشقە تورەهاتەکانی ناو ئەفسانەکان و ئەوانەی هەمووشتێکیان ئەکرد تەنیا عەشق نەبێت
من لەنامەیەکدا بۆم نووسیبووی مەمپەرستە عەزیزم با وەك عاشقەکانی دی پێکەنینم بە خۆم نەیێ
با وەك سەردارەکانی دیکەی دونیا مەغرور نەبم
ئاخر من چیم بێجگە لە هەناسەی برکە گیایەك
من چیم جگە لەرەنگی دڵۆپە ئاوێك لەناو تۆپەڵێ قوردا
ئای عەزیزم سێبەر خان
چەند ماندووم .. بەو تورەییەی خۆمەوە
چەند دڵرەقم لەو نامەیەدا

ئەمشۆ ژیان لە تامی تلیاك و حەشیشە و هەموو درەگەکانی دونیا ئەکات
گەرووم پرە لەحەشیش و نامەیەك لە خشخاش ئەنووسمەوە
تۆ بزانە عەزیزم سێبەر
نامەیەکی کورت بەقەد قەدی رێحانێك چ بێهۆشییەك ئەخاتە جەرگمەوە
نامەیەك چ بۆنی کیمیایێك ئەخاتە هەناومەوە
ئەوشۆ .. نەدەستی تریفە و نەچاوی هەندۆم ئەگاتێ
ئەمشە و نە رووەمەتی ئەرژەنگ و نە پەرچەمی نێرڤانام ئەگاتێ
ئەم سکرینەش بۆنی هیرۆیین و تۆزی کۆکائین ئەکا بە ژوور و جەرگمەوە
بۆ ئەبێت وا تورە بم ئەی سێبەر خان؟
بۆ ئەبەد ئەوەندە دڵپڕ بم لەوشەیەك کە رەنگە هیچ پەیوەندی بە تریفە و هەندۆ و ئەرژەنگ و نێرڤاناوە نەبێت؟
بۆ ئەبێت نامەیەك بنووسم کە هیچ عیلاقەی بە با و گوڵ و هەتاو و تەم و گەوارەکانەوە نەبێت؟
بۆ ئەبێت دەست لە شتێك وەردەم کە بۆنی منی لێنەیەت؟
با برۆم و بە چاوی دیارەوە کە ئەمرۆ سعاتێك باسی خۆشەویستیمان پێکەوە کرد و سەرەنجام سوور بووم لەسەر
ئەوەی عەشق گەورەترە لە کائینات
گەورەترە لە هەڵەکانی مرۆڤ
سانایە عەشق تێکدەیت، سانایە عەشق فرێدەیت و بیکەیتە تەرم و لەدوای خۆتدا هەڵیگریت
لێ زەحمەتە دیار زەحمەتە بیسووتێنیت
زەحمەتە بیکەیتە تەرم و بەدیارییەوە جەرگت کون کون نەبێت

ئەو ژیانە تامی حەشیشە ئەدات
ئەو دونیایە بۆنی ئەفیونی لێدێت
عەجەب ئاگادار نیت؟

لە نامەیەك بۆم نووسیبووی من داستان نیم و گۆرانی نیم
من عازفی سەربوردەیەکی گەورە نیم
جەرگم خاڵییە لە سیحر و
روحم سەراپا سارایەکە بێ سەراب
من بۆم نووسیبووی پاییز لە کێڵگەکانی حەشیشی مندا شین نابێت
فڕین لە رۆحی مندا ناچێتە گیانی کۆترە شینکەیەکەوە
من زوو خۆم ناسیبوو
لە گەڕانەکانی باخچەکانمدا ئەوەم زانیبوو من نامە شتێك شیرنتر لە ئەفیون
نامە شتێك جوانتر لە خەزان
من نووسیبووم .. کوڕێکی دی بە وێنەی خورشید رۆژ ئەکا بە هەناسەتدا
کۆڕشێك وەکو خاوەر ئەڕژێ بەسەر باڵەکانتدا
خەسرەوێك وەکو گەوارە باران ئەکاتە سەر مەمکەکانت
من بۆم نووسیبووی ، بەلاٌم کە بە دەستت نەگەیشتن خەتای من نەبوو
خەتای عەشق بوو ئەی ئەزیز
خەتای عەشق بوو..
خەتای من و پەلکی ئەو لاولانە نەبوو کە بە دلۆپەکانی جۆگەلەیەك ئەمنووسین
خەتای ئەو پەلکە چنارانە بوو کە نەیانئەتوانی بە باشی نامە و شعرەکان بپێچنەوە و لەگەلٌچ وشە ئاوییەکان تەڕ نەبن
خەتای من نەبوو .. وەك چۆن ئێستاش خەتای من نیە لەسەر ئەو سکرینەوە
هێشتا وشەکان پڕن لە تام و بۆنی لاولاوە و ئاو و پەلکی چنارەکان
خەتای من نیە ، خەتای تۆ نیە ، خەتای ئازیزان نیە .. خەتای کەس نیە
خەتای جوانیە، کە ئەیەوێ هەمیشە شەڕ لەگەڵ من و تۆ بکات
خەتای عەشقە کە هەرگیز دەست هەڵناگرێ لە شەڕە جوانەکانی خۆی
خەتای دڵە کە هەردەم بەدوای میهرەبانیدا ئەگەڕێت
خەتای جەرگە کە بەردەوامە لە سەفا

خەتای دونیایە کە هەمیشە بەدوای تامێکەوە وێڵە بۆ ژیان
خەتای من نیە
بەو نابووتییەوە ، لەسەر وشەی نامەیەکت ئەو شەڕە بکەم
خەتای من نیە بۆ ئەبەد دڵپڕبم و پڕبم لە خۆشەویستی
خەتای من نیە نەتوانم بۆنی حەشیش لە گەرووم بسووتێنم
خەتای من نیە .. خەتای تۆ نیە .. خەتای کەس نیە ئەی ئەزیزم

فەنی یەکسەر گووتی: تۆ هەمدیسان ئەو شتانە ئەڵێیەوە کە پێشتر باست کردوون، کێشەی تۆ ئەوەیە نــاتوانی خۆت ئازاد کەیت و ڕێگە بدەیت شعرەکانت وەك خۆیان بدوێن نەوەك وەك ئەوەی تۆ ئەتــەوێت، تــۆ پێویســتیت بەوە هەیە زیاتر ڕێ بدەیتە روحت خۆی بنووسێتەوە، ئەوکاتــە ئــارامتر ئــەبیت و بەختــەوەرتر ئەنووســیت، تــۆ هەمیشە ئەتەوێت شتێك بە یەکێك بگەیەنیت کە زۆر لێتەوە دوورە، لێت تێناگات، گــوێی لێــت نــابێ و تــۆ ناتوانی بە دەنگێکی بەرز بانگی بکەیت، ئەوەیان کێشەیەکی گەورەی تۆیە.

= پێت وایە من خەتابارم؟

+ لەچی خەتابار بیت؟ لە عەشق و مەحەبەت و ئەڤین و گەڕان بەدوای سەفا؟ نا لەوانە خــەتابار نیــت. ڕەنگــە خەتای تۆ ئەوەبێت زیاد لە پێویست هەستدار و سۆزدار بیت، زیاد لەوەی خۆت ئازار نەدەی.

= کێشەی من ئەوەیە نامەوێت بە هیچ بگەم، بەڵام هەمووشتەکان بــە مــن ئەگەنــەوە، ئــەو گەیشــتنانە مــن ئەکوژن و تەواوم ئەکەن، نووسینیش یەکێکە لەو ڕێیانەی پێیەوە ئەمەوێت هەموو شتەکان لە گیانی خۆمــدا دەرکەم و دووریان کەمەوە. ئەمەوێت هەمیشە لەگەڕان بم و بەدوای یەکدیــدا بکەینــە غــار بێئــەوەی بەیــەك بگەین.

+ بەڵام ماندوو نابی لەو غارغارێنە.

= هەندێجار با بۆیە لەوساتانەدا ئەنووسم، یان دێم خۆم لە ناو تۆدا غەرق ئەکەم.

+ منیش ماندووبووم لەو گەمانەی تۆ.

= باشترە لەوەی ماندوو نەبیت، نامەوێت تۆش بە ئاسانی بە من بگەیت.

+ بێزارم ئەکەیت.

= نزانم بێزار ئەبیت یان نا، بەڵام ئەگەر وانەبێت من بێزار ئەبم.

+ جا بۆ تۆ ئێستا بێزار نیت؟

- نزانم من هەست ئەکەم لە گێژاوێکی بەردەوامم ، گەڕانەکان و سەفەرکردن بەناو شتەکاندا ڕۆیشــتنە بــەناو گەردەلوولدا.

ئیدی من هەمیشە بە ناو گەردەلوولەکاندا ڕێ ئەکەم و ناتوانم خۆم لە با و بۆران و زریانەکان بپارێزم، نـاتوانم نە بە هێمنی و بە هێوری سەر بکەم بە ژوورێکی ڕوحمدا یان کەسێکدا، هەموو شتەکان شێواون و لەبەر یـەك ترازاون و یان خەریکە لەبەر یەك ئەترازێن، بابەك هەموو شتەکان هەڵئەگرێت و نـاتوانم سـەفەرەکەم لەگـەڵ تریفە و خواو دەفتەرەکەی قەتمەردا تەواو کەم. ئەوانە بۆ مـن شـێواویەکن، ڕێ نـادەن لەگـەڵ ڕوحـی خۆمـدا پیاسەیەکی هێمنانە بەرەو غەیبستانێك دەست پێبکەم کە لەوێدا بـۆ دواجـار بـە تریفـە و خـواو بـرادەران و نیشتمان و کچەکان و ژنەکان و باوکە دڵرەقـەکان و شـەڕکەرە دەسـت بـە خوێنـەکان و دونیـا و ژیـان بڵـێم، هەموومـان پێویستیمان بەوە هەیە پڕ بین لە گومـانی جوان لەیەکدی، نەکەس ئەویدی ئەسیر بکات و نەکـەس یاری بەقەدەری ئەویدی بکات، من دەفتەرەکەی قەتمەر لـە تریفـە وەرئـەگرم و ئـەڵێم بـا ئـەو دەفتـەرە لێـرە بەجێبێڵین، نایبەین بۆ سەفەرێك کە ڕەنگە لەوێدا باش نەبێت بۆنی خوێنی پێ وەرکەین، باش نەبێت چـیرۆکی ئەو هەمـوو مـەرگانە بلاّوبکەینەوە، خۆش نەبێت سەربوردەی خوێن و کوشتنەکان بە گوێی ئاواییەکاندا ببەین، بابڕۆین و چیرۆکی عـەشقە نامورادەکان لێرە بەجێبێڵین بەڵکو لەوێ وانەیەکی نوێ لە عـەشـق و خۆشەویسـتی فێربین لە ڕۆحی خۆماندا بیدۆزینەوە، بەڵکو لەوێ سروشتێك هەبێت هەمیشە دەستمان بۆ کۆتا بگرێت بـەرەو نادیارییەکی ڕەها و لەناو نادیارییەکی ڕەها یەکدی ماچ کەین و هەرگیزیش نەگەینە خۆشترین ماچەکانمان، با بڕۆین ئەزیزەکەم .. بڕۆین دڵمان پڕ کەین لە گومان و بە ئەستێرەکان بڵێین توخوا هەر بەو ڕەنگ و ڕوخسـارەی خۆتانەوە پرمان مەکەنەوە لە ڕێگە یەقینەکان و هیچ شتێکمان نیشان مەدەن، با بڕۆین و بێ ئەوەی پلانێکمان هەبێت بۆ ژیان بڕۆین.

با بڕۆین و یادگارییەکانی منداڵی لەوێ بـە شـێوەیەکی دی ورد کەینـەوە و بـەڵکو میهرەبانانـەتر بڕوانینـە کەسەکان، بەڵکو لەوێ پێم بکرێت داوای لێبوردن لەو کوڕە بکەم کە دامە بەر موسێکی تیژ و پـرم کـرد لـە برین، بەڵکو داوای لێبو ردن لە هەتاو بکەم بۆ هـەمـوو ئـەو نامـانـەی نـەیانتوانی بـڕوای پێبکـەن کـە مـن خۆشمئەوێت، داوای لێبوردن لە گوڵەکان و خەلیاقەتەکان کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەزیەتم داون، با بڕۆین و ڕوحـی قەتمەر بە شیلاوی گوڵێك بسپێرین کە لەسەر لێوی هەنگێکدا ئەبێتە هەنگوین. ئیدی ئەبێت بەسـکەین لـەو ڕۆیشتنە بەناو تۆفانەکان و خۆمان بدەینە دەست قەدەرێکی دیکە و ئاوو هەوایەکی دیکە، بـا ئـەو پلانێکـی دیکەمان بۆ دابڕێژێ کە ئێمە دەسکاری نەکەین،

ئیدی لەوێوە بتوانم لەسەر برژانگەکانت بنووسم، لەسەر سینگ و مەمکت بنووسم، لـەوێوە ،لـە سـاتێك لـە ساتەکاندا من و خۆم و تۆ و خوا و گوڵە شلێرەکان و قەتمەرەکانی ڕۆحم لە ژوانی ڕوحم بین. من لە هـەمووتان گەورەتر و دیارتر ئەتانبەمە ناو ئاوێنەیەك لە ئاوێنەکانی ژیان ، من تیایدا بوومەتە پەلکە گیایەکی پـڕ لـە خوناو ، لەو ساتەدا هەمووتانم خۆشئەوێ دەست ئەخەمە ملی هەموانتان ، بە گومانەوە پێتان ئـەڵێم ئێـوەم خۆش ئەوێ وانیە برادەرینە؟ هەمووتان ماچ ئەکەم و ئەڵێم چەند جوانە لـە کۆتاییەکانـدا سـەرەتایەکی نـوێ ببینینەوە؟ چەند خۆشە ئارام نەگرین لە ژیاندا تا لە پەلکە گیایەکـدا ئەبینـە مامزێـك و لەویشـەوە ببینـە

سڤۆرەیەك و لەویشەوە كانیاوێك و لەویشەوە بۆ كوریكەیەك . چەند خۆشە بەردەوام لە جوانییەكەوە بۆ جوانییەكی دی بەناو ئەو تۆفانەدا ئەگۆڕییێن و ئەتوانین لە ساتە زۆر بچووكەكاندا ببین بە شتێكی نویێ. لە ساتێكدا من ئەتوانم لەسەر برژانگێكت بنووسم و لە ساتێكی دیكەدا وەك پەپوولەیەك لەسەر پرچتدا بنیشمەوە و لە ساتێكی دیكەشدا وەك با خۆم لە لەشت هەڵسسوم و لە ساتێكی دیكەشدا وەك هەتاو بەسەرتدا وەربم ...

ساتەكان و بوونی خۆم ، تۆفانەكانی و زەمەنی روحی من، لەوێوە ئەتوانم بە ئاسوودەیی شعرێكت لە سەر برژانگەكانت بۆ بنووسم و باكم نەبێت لە مردن و ئازارەكانی گیان، بێباك بم لەو گێژاوەی گیانم ئەبا و ژیانم ئەداتیێ.